

زاره ڤاند



# تورانیتی



## وه‌ده‌رکه‌وتن، ئایدیۆلۆژیاو به‌رنامه

وه‌رگێرانی له‌فارسی‌یه‌وه

ئه‌بوبه‌کر خۆشناو




## وەدەرکەوتن ، ئایدیۆلۆژیاو بەرنامە

زارە ڤاند

وەرگێڕانی لە فارسی‌یەوە : ئەبوبەکر خۆشناو

١٩٩٦

زاره ڤاند
(تورانی یه کگرتوو سه ربه خۆ)
تورانچێتی
وه ده رکه وتن، ئایدیۆلۆژیاو به رنامه
وه رگێری فارسی : محمد رضا زرگر
چاپی یه که م: زستانی ١٣٦٩
(انتشارات بینش باهمکاری انتشارات پروین)

وه رگێری کوردی: ئه بوبه کر خۆشناو
چاپی یه که م: ١٩٩٦
هه ولێر

# دەربارەی ئەم کتێبە

رەنگە زۆربەی خوێنەران زاراوەی (تورانی)یان (تورانچی)یان (توران)یان وەك ناوی وڵاتێکی دوور بیستبێ، یان گوێیان لەوشەی (توران) لەبەرامبەر ئێراندا بووبێ، بەڵام کەمن ئەوانەی دەزانن (تورانی) چی‌یەو کەمتریشن ئەوانەی زانیاری‌یەکی ووردیان دەربارەی هەیە.

(تورانی) وەك زاراوەیەکی سیاسی بەو کەسە دەگوترێ کەهەستی تورکایەتی‌یەکی بەهێزی هەبێ‌و بەگوڕ بۆ بڵاوکردنەوەی‌و چەسپاندنی ئەو هەستە تێدەکۆشێ‌و زۆرتر بەوانە دەگوترێ کە رووەو تورکیا رادەوەستن‌و تورکیا وەك رێنوێن‌و براگەورە تەماشا دەکەن‌و بۆ وەدی هاتنی ئەم مەبەستە پێیان‌وایە تورکیا جێ‌بەجێ کەرو وەدی هێنەری ئەو ئامانجەیە.

ئەم هەستە لەدوای لەبەریەك هەڵوەشاندنەوەی یەکێتی سۆڤیەت‌و سەربەخۆبوونی کۆمەڵێك کۆماری تورك زمانی وەك: ئازەربایجان، قەرغیستان، قازاغستان، تورکمانستان، ئۆزبەگستان، داغستان_ لەبەر چەند هۆکارێکی تر بەتایبەتی ئابووری_ جارێکی‌دیکە بووژایەوەو تورکیاش ئەو هەلەی قۆستەوەو دەیویست رۆڵێك کە ساڵانی شەری یەکەمی جیهاندا لەدەستی چووبوو، وەدەست بخاتەوە.

ئەم کتێبە کە چەند ساڵێکە کراوەتە کوردیو چەند بەشێکی لێ بڵاوکراوەتەوە، لەسەرهەڵدانو دەست پێکی بزووتنەوەی تورانچێتیو گەشەستاندنی بەتایبەتی دوای پەرینەوەی بۆتورکیا دەدوێو بەبەڵگەوە ئایدۆلۆژیاو بەرنامەکانی روون دەکاتەوە، خوێندنەوەو ناسینی بزووتنەوەی (پان تورانیزم)ـ وەك کاوە بیات ـ لەپێشەکی چاپی فارسیدا روونی دەکاتەوە لەبەرچەند هۆیەك گرنگو بایەخدارە:

یەکەم: ( بەهۆی بایەخە مێژوویییەکەوە، واتە لە روانگەی ئاشنابوون بە قۆناغێکی گرنگی مێژووی گۆرنکارییە سیاسیو رۆشنبیرییەکانی تورکیای هاوچەرخو کاریگەرییەك کە ئەم وەرگۆرانو وەرچەرخانە لە چارەکی یەکەمی سەدەی بیستەمدا کردییە سەر پەیوەندییەکانی عوسمانی/ تورکیا بە وڵاتانی دراوسێ) .

دووەم پێویستی ناسینی دیاردەی تورکچێتی لە رووی سیاسییەوە ).

سێیەمیش: ئێمەی کورد کەمو زۆر ژیانمان ـ مامەڵەو چارەنووسمان ـ بە تورکانەوە گرێ دراوە، پێویست دەکا لەرەگەوە بیناسینو تێی بگەین تابتوانین واقیعییانە مامەڵەی لەگەڵدا بکەین.

****

کتێبی (تورانچێتی) کە لەساڵی ١٩٢٦دا بەزمانی ئەرمەنیو بەناوی خوزراوی (زارەڤەند)وە بڵاوکراوتەوە، ( زاونو ڤارتوهی نەعلبەندیان) نووسیویانە. ئەوان کتێبەکەیان ناونابوو (تورانی یەکگرتوو، سەربەخۆ)، وەرگێری فارسی وای پێ باش بووە بیکاتە ( ئەفسانەی پان تورانیزم)، ئێمەش بۆ باشتر دەرخستنی ناوەرۆکەکەی لە لای خوێنەران، حەزمان کرد بیکەینە: ( تورانچێتی.... وەدەرکەوتن، ئایدیۆلۆژیاو بەرنامە).

هیوادارم خزمەتێکی گچکەم پێشکەش بە هاوزمانەکانم کردبێ.

**ئەبوبەکر خۆشناو**

هەولێر ـ سەرەتای ١٩٩٦

# تۆران

تەماشایەکی نەخشەی ئەورووپا- ئاسیا لەئاستانەوە بەرەو رۆژهەلات، سەرەتا، ئێمە لەبەرزاییەکانی ئەنادۆل (کە ئەمڕۆ دوای رەشە کوژی ئەرمەن، سەرکوتی کوردو راگویزانی گەلە جۆراوجۆرەکان بۆ شوێنی دوور، هەمووی بۆتە تورك)و پاشان ئازەربایجانی ئێرانو ناوچەکانی خواروی دەریای خەزەر (قەزوین) بەرەو ئاسیای ناوەراستو دیسان بەرەو رۆژهەلات، واتە تورکستانی رووسو تورکستانی چین دەباو لەرێگای شاخەکانی (سایان)و (کینگان)ەوە دەگەیەنێتە دەریای ژاپۆن، ئەو دەم بەرەو باکوور تالێوارەکانی ئۆقیانووسی بەستەلەکی باکوور سەرمان دەخاو بەرەو رۆژئاوا دەمانگێرێتەوەو بەیەك قەلەمباز دەمانگەیەنێتە فنلاندو لێواری بالتیك، پێش ئەوەی لەرێگای هەنگاریاو بولگارستانەوە بۆ ئاستانەمان بگێرێتەوە. لەکۆدا، ئەم ناوچانە کە هەندێ جار بەرینو هەندێ جار گچکە، هەندێ جار پەیوەستو هەندێ جار لێك جودان، جێگای دانیشتوانی گەلانێکن بەرەچەلەك تورانینو ژمارەیان لەسەد ملیۆن تێدەپەرێ.

تورکانی عوسمانی دانیشتووی ئاستانەو ئەنادۆل، تەترەکانی قەفقازو ناوەندیو خواروی روسیا، تورکو تورکمانەکان، ئۆزبەك، مەغۆل، مەنجوو تۆنگۆزەکانی ناوەراستی ئاسیا، دانیشتووانە رەسەنەکانی سیبریا، فنلاندییەکانی فنلاندو ولاتەکانی بەلتیكو لەدوایشدا هەنگاریو بولگاری، هەموویان بەرەسەن تورانین.

لەسەرتاسەری ئەم ناوچە جوگرافییانەدا، گەلانی هاوریشەو هاوڕەچەلەك بەگەلێ جۆر بلاو بونەتەوە. لەهەندێ شوێن، وەك تورکستان ئاپۆرەو لەشوێنی دیکە وەك سیبری پەراگەندەن. لەهەندێ شوێن بەگەلانی دیکە دەورە دراون، وەك لێوارەکانی فۆلگاو سەردەمێ بەتەواوی لەرەسەنی خۆیان دابران وەك فنلاندی، هەنگاریو بولغارییەکان. ئەو گەلانە پێرەوکەری ئایینی جۆراوجۆرن - مەسیحی، ئیسلام، ئایینی شەمەنیو هی دیکەش- و چونکە بەشارستانیەتی جۆراوجۆرەوە پەیوەستن - مەغۆلی، چینی، ئیرانی، رۆژئاوایی- بەگەلێ زمانی جودا قسان دەکەن: تۆنغوز، فنلاندی، هەنگاریو زاراوە جۆر بەجۆرەکانی تورکی...

بەڵام لەم ناوچە زۆر فراوانەی کە لەدەریای سپی ناوەڕاستەوە تادەگاتە دیواری چین، نەتەوەی تورانی بەزمانو ئایینی هاوبەش وەك زنجیرێکی نەپچڕاو پێکەوە بەستراونو لەگەڵ یەکدیدا جێگۆڕکێ دەکەن، تەنیا هۆکاری ژیوپولیتیکی بێگانە کە یەکدەست بوونی ئەم زنجیرە دەخاتە مەترسیەوە، ئەرمەنستانو ناوچەکانی باکووری ئێرانن.

زاراوەی (توران) بۆ یەکەمین جار بەشێوەی (تورە)و (توریا) لە بەرامبەری ئێرانو ئاریا لەئاوێستای زەردەشتدا ناوی هاتووە. (تور) یەکێك لەو سێ برایانە بوو کە مرۆڤ لەوانەوە زیادیان کردووە. دوو براکەی دیکە، (ئاریا)و (سئیریم) بوونو (ئاریا( باپیرە گەورەی ئێرانی‌یەکانو (سئیریم) باپیرە گەورەی نەتەوەکانی رۆژئاوا بوون. گەلانی (توریا) هەمیشە دوژمنی گەلانی ئاریایی بوون. شەڕی خوێناوی نێوان ئێرانو توران، بەدوورو درێژی لەشانامەی فیردەوسی‌دا، باس کراوە.
چینیش بەگوێرەی خۆی، ماوەیەکی زۆر لەگەڵ هۆزە تورانی‌یەکان لەشەڕدا بووە. مێژوونووسانی چین لەکۆنەوە واتە لەساڵی (١٤٠٠) پێش زایین قسە لە لەشکر هێنانی بەردەوامو کوشتنو تاڵانی هێزەکانی (هسیونگ- نون)ی دڕندە دەکەن، کە هۆزی (تو - کیو) (واتە تورکان) بەشێکی بوو.
ئەو گەلانە خۆیان بەتورانی نەدەزانی. ئەوان لەشکر لەشکریان (یورت)ی جۆراوجۆر بوونو بەناوی سەرۆکەکەیان یان (تومغا)ی خۆیان ناودەنران. لەواقیعدا، (توران) هۆزێکی گچکە بوو، لەشکرێك لەناو لەشکران. زاراوەی (تورانی) کە پاشان بەنەژادی (ئورال- ئالتایی) گوترا، زاراوەیەکی زمانەوانی‌یە نەك جوگرافیایی‌و نەژادی، بەڵام هێواش هێواش واتایەکی وای بەخۆوە گرت.
هەڵبەتە (توران) کۆی ئەو وڵاتانەی تورانی‌یەکانی لێ‌دەژین، دیاری ناکا، هەروەك هەر ناوچەیەکی ئەرمەن- نشین بەئەرمەنستان ناژمێردرێ. (توران) وەك جوگرافیا، ناوچەیەکە گەلانی رەسەن تورانی تێدا نیشتەجێن، واتە ناوچەی کوێستانی ئورال - ئالتایی لەناوەڕاستی ئاسیا.
گۆڤاری (توران) کە لەهەنگاریا بەزمانی هەنگاری دەردەچوو، ژمارەی کانوونی دووەم - شوباتی ١٩١٨ی تایبەت بوو بەوڵاتی (توران)و لەلاپەڕە (٨٤)دا، سنووری (توران) بەم شێوەیە دیاری دەکا: دەریای خەزەر، بەرزایی‌یەکانی ئێران، سەرچاوەکانی سیردەریاو ئێرتیش، بەرزایی‌یەکانی ئاخمولینسك کە ناوچەیەکی کوێستانی‌و چۆڵەو رووباری گەورەو دەریاچەی جۆراوجۆرو دەشتی بەپیتی تێدایە.
بەم پێیە، دوابەدوای داگیرکردنی ئەم وڵاتە لەلایەن تورکو تەتەرەکان، زاراوەی (توران) دەبوو بگۆڕێو سەرەنجام ببێتە زاراوەیەکی بەرامبەر بەوڵاتانی تورکو تەتەر. لەم ئۆقیانووسە بێ‌پایانەی مرۆڤە سەرەتایی‌یەکان بوو کە لافاوی هێرشکەرانی بەردەوام هاتە خوار: ئاتیلاو هونەکان، ئەرپەردو هەنگاریەکان، ئیسپریشو بولغاری‌یەکان، ئالپ ئەرسەلانو سەلجوقی‌یەکان، توغرولو تورکانی عوسمانی،

جەنگیزخانو تەیمووری لەنگو هۆزە خوێن خۆرەکانی مەغۆلو تەتەر کە شارستانیەتی کۆنو ناوەڕاستی رۆژهەلاتو رۆژئاوایان وێران کردو خنکاندیان.

دەسەلاتی رووسەکان بۆ ماوەیەکی کەم، ئەم بوڕکانەی تورانیەتی خامۆش کردو نەژادی سلافی بەسەردا زال کردن. ئەمما ئەمڕۆ لەنێو ئەو کلاورۆژنەو کەلێنانەی دوو شۆڕشی رووسیا کردوویەتی‌یەوە، گرمەی بوڕکانی تورانی لەهەموو کاتێ توونترو ترسناکتر دێتە بەرگوێ. دیواری نێوان تورکو تەتەر درز دەباو هەموویان لەدەوری بەهێزترینو ئاپۆڕەترین ولاتیان کە تورکیایە، کۆدەبنەوە.

تورکیش لەلایەك لە ئەوروپا وەدەنراو لەرۆژهەلاتی ناوەڕاستیشدا لاواز بووە، لەلایەکی دیکەشەوە لەمۆرکی (عوسمانی) کە بەوە لەبرا هاورەگەزەکانی جودا دەکرایەوە، رزگار بووە، ئەمڕۆ بەرەو رۆژهەلاتی دەڕوانێ.

ئەمڕۆ ناوی (توران) لەروانگەی گەلێ دەستەلاتدارانی ئەو گەلانە بۆتە نیشانەو دروشمی کۆمەلانی هاوخوێن کە لەئۆقیانووسی ئارامەوە تادەریای ناوەڕاستو لەچینەوە تائۆقیانووسی بەستەلەکی باکوور، فراوانە. ئەم ناوە، ئەوان بۆ شەڕێکی گەورە لەپێناوی پێکهێنانی (تورانی یەکگرتوو سەربەخۆ) لەئایندەدا، بانگ دەکا.

# رەگو ریشەی پان تۆرانیزم

ئەگەر بنەچەی پان تورانیزم بەتورکیا لەقەلەم بدەینو هەلسوڕێنەرەکانی بەبەگو پاشاکانی ئاستانە بزانین، هەلەمان کردووە. پان تورانیزم لەواقیعدا جۆشو خرۆشێکی نەژادیو رۆشنبیری یەکی گشتی یەو جگە لەتێزێکی خەیالی لەمێشکی تورکاندا، شتێکی دیکە نی یە.

لێرەدا(پان تورانیزم) بەواتا فراوانو بەسنووره ئەوروپایی. ئاسیایی یەکەیەوه کە لەلێکۆلینەوه مێژوویی یە - سۆسیۆلۆژیکی یەکانی نەتەوه تورانی یەکانی ئەوروپا دەبینرێ (هەنگاری یەکان، فنلاندی یەکان، بولغارەکان)، بەتەواوی مۆرکێکی ئەکادیمیك بەخۆوه دەگرێو (١) هەموو نەتەوەو نەژادەکانی خێزانی ئورال- ئالتایی دەگرێتەوەو لەبەشی یەکەمدا باسمان کردووە، لەبەرچاو ناگرین، ئێمە تەنیا لەپان تورانیزمی تورکان دەکۆلینەوه کە ئەگەر چی لەرووی تیوری یەوه، خۆی لەگەل «پان تورانیزم»ی گەوره یەکسان دەژمێرێ، بەلام بەکردەوه هەولو کۆششی لەچوارچێوەی تورکو تەتەردا دەهێلێتەوەو هەر ئەوانیش بەتورك دەژمێردرێن. ئەم کارەش مۆلەت بەتورکان دەدا تا ئەم جۆره پان تورانیزمە بەزاراوەی پان تورکیزم بەرجەستە بکەن.

لەم تێزە سیاسیو بەرنامەیەی تورکو تەتەردا، گەلێ شتی سرنج راکێش دەبینرێ.

لەگەل هەندێش، پان تورانیزم دوور لەسنوورەکانی تورکیاو لەنێو گەلە موسلمانەکانی رووسیا پێی گرت: تەتەر، قەرغیز، باشقیر، نەشارەکانی ئوفاو قازانی تەتەرستانی سەروبوو کە دوو بنکەی سەرەکی پان توانیزم -امەزران «تورك یوردو»و «تورك ئوجاقی»و پاشان لەلایەن دامەزرێنەرەکانیانەوه بۆ ئاستانەو ئەنقەره گوێزرانەوەو ئەوێ کرانە ژوانی تورکە لاوەکانو بنکەی کەلەکبازیو پیلانی سیاسی یان، بۆیە لانکەی ئەم بزافە نەتەوەیی. نەژادی یە لەسەدەی نۆزدەو لێوارەکانی فۆلگاو دوور لەکەنارەکانی بۆسفۆر بوو.

ئەم دیاردەیە مایەی سەرسوورمان نی یە، چونکە ئەم ناوچەیە لەژێر دەستەلاتی بێگانەکاندا بوو، لەکاتێکدا ئاستانە پێتەختی ئیمپراتۆریەتێکی تورك بوو. هەستی نەتەوایەتی (کە پاشان هەستی نەتەوەیی. نەژادی ناونرا) لەنێو نەتەوەی ژێر دەستەلاتی بێگانەکاندا زەمینەیەکی لەبارتر بۆ چەکەره کردنو پێگەیشتن دەدۆزێتەوه، نەك لەنێو گەلانی سەربەخۆدا.

لەسالی ١٢٤٠، «باتو» نەوەی جەنگیزخان رووسیای داگیرکرد. بیابان

گەڕەکانی، کە لەژێر ئاڵای لەمووی کلکی ئەسپ دروست کراوی هۆزەکەیان دەجەنگان، شارستانیەتی سلاف. بێزەنتی (کییف)یان خاپوور کردو شازادە مۆسکوییەکانیان وەك (خزمەتکارە سادەکان)ی خۆیان، کردە خزمەتکاری خانەکانی (باغچەی سەرای).

دوای سێ سەت ساڵ، واتە لەسەدەی شازادەی زایینیدا، رووسەکان توانیان دەستەڵاتی تەتەرەکان تێك بشکێنن، (ئیفانی ترسناك) هێزی ئۆردووی زێڕینی تێك شکاند، ئەم جارە نۆرەی خانە بەفیزەکان بوو کە خۆیانو هۆزەکانیان ببنە خزمەتکاری سادە.

لەگەڵ هەندێش، دنیای تورکو تەتەر لەگەڵ شکستە خراپەکانیشیان، لەدەست دانی سەربەخۆییو رووچوون لەخەوێکی چوار سەدەییدا، بەسوور بوونێکی جیدی بەناسنامە نەژادییەکەیانەوە نووسابوو، لەو ناوچانەی زۆربە تورکو تەتەر بوونو هەروەها لەو ناوچانەش کە دوورگەی گچکەیان لەنێو ئۆقیانووسی سلافیەکاندا پێك دێنا، ئەو نەتەوانە هەموو تایبەتمەندییەکانی خۆیان - رێو رەسم، ئایین، زمانو رۆشنبیری. دەپاراست.

لەبەر هەندێ لەنیوەی دووەمی سەدەی رابردوودا تەتەرەکان هاوکات لەگەڵ نەژادو نەتەوەکانی دی لەخەوێکی قووڵ راست بوونەوە، سیاسەتی رووسیای تزاری لەبەرامبەر «نەتەوە موسلمانەکانی رووسیا» تاساڵەکانی ١٨٣٠، بەزۆر بەمەسیحی کردنیان بوو، پاشان، ئەم سیاسەتە ناڕاستەوخۆ بەڕێوە دەبرا، واتە گۆڕینی ئایین بەهۆی قەشە مەسیحییەکانو بەرووسی کردنی رۆشنبیری بەهۆی کردنەوەی قوتابخانەی نوێ، بەڵگە نەویستە کە ئەم سیاسەتە دەرهەق بەهەموو کەمینەکانی رووسیا پەیڕەو دەکرا.

بۆیە دەبوو هەستی (نەتەوایەتی) تەتەرەکانی ئیمپراتۆریەتی ترازی بەشێوەیەکی زۆر تایبەتی هەبێ: داکۆکی لەشەریعەت لەبەرامبەر هێرشی کافرە رووسەکانو پاراستنی موسلمانان لەمەترسی گۆڕانی ئایین، ئەم سیما ئیسلامییەی بزافەکە وای کرد تەتەرەکان ئیلهامو پشتگیریان لەئاستانە، بارەگای خەلیفەی موسلمانانەوە بۆبێ.

رێبەرایەتی ئەم بزووتنەوەیە ئیسماعیل گەسپەرینسکی، نووسەری سیاسی بەناوبانگی تەتەر بوو، گۆڤاری «تەرجومان» کە لەساڵی ١٨٧٩ لە (باغچە سرای) (کرێمە. قەرەم)ەوە دەردەچوو، بەپێشڕەوی ئەم بزافە دادەنرا، دوای ئەوە، بڵاو کراوەیەکی تر بەناوی (ئەکینجی) بڵاو کرایەوە، بەڵام زۆری نەخایاند لەقەفقازیش، (میرزا فتحعلي ئاخوند زادە) لەم رێگایەدا هەنگاوی هەڵێنا.

ئەم رەگەزە گرنگانەی بزووتنەوەی تەتەرەکانی رووس کە هەڕەشەی رووسی کردنیان لێدەکرا، هەولیاندا لەیەکەمین دەمی ژیانی رۆشنبیریو ئایینیدا، کۆمەڵانی خەڵکی نەزان هۆشیار بکەنەوەو فێرە خوێندەوارییان بکەن. ئەم کارە نێوەندە خۆپارێزەکانی توورە کردو ئەوانیان بەکافر ناودەبرد. بەڵام ئەوان توانیان کەسانی نیمچە رۆشنبیری نەوەی نوێو وەگەڵ خۆیان بدەنو بەم شێوەیە لەبەرامبەر ناحەزەکانیاندا بەسەختی بەرگری بکەن. ئەم قۆناغە بەململانێی زۆر توندی نێوان

(مزگەفت)و (خوێندنگا) دەناسرێ.

لەو کاتەدا، سیاسەتی تزاری بەرەو ناسینی ئیسلام، پارێزگاریو، دژایەتی هەر هەولێك بۆ گۆڕینی شێوەی ژیانی نەتەوە موسلمانەکان، دەچوو بۆ ئەم کارەش سوودیان لەتەتەرە پارێزکارەکان وەردەگرت. بەپشتیوانی هەندێ مەلا، گەلێ کەسی خوازیاری گۆڕانیان لەنێو بردو تاوانباریان دەکردن بەوەی دەیانەوێ (زانیاری ئالوودە بەکفر) ببەنە نێو مزگەفتو خوێندنگاکان. بەم شێوەیە برایانی پوکینسکی، ئەحمەد طە با طە بایفەو گەلێ ریفۆرمیستی‌تر گیران یان بۆ سیبریا دوور خرانەوە.

هاوکات لەگەڵ بزووتنەوەی چاککردنی ئایین، جۆرە هەستێکی ناسینی نەژادیش لەنێو نەوەی نوێی تەتەر کەوتە جۆش. ئەو نەوەیەی لەقوتابخانەو زانکۆ دەوڵەتی‌یەکاندا دەرسیان خوێندبوو، وەك لاوانی شۆڕشگێری رووس هێواش هێواش توونە ڕەوتر دەبوون، بەڵام ئامانجەکانیان کە زۆرتر جیهانی بوون، قبووڵ نەدەکردن. دیاردەیەك، کە لەروانگەی شۆڕشگێڕانی میللەتێکی سەردەستە سروشتی‌یەو لەگەڵ بەرژەوەندی‌یە نیشتمانییەکانیاندا جوتە، لەروانگەی کەسانی نەتەوەی ژێر دەستە کە ئارەزووی ئازادی‌یان لەمێشك دایە، سرنج راکێش نی‌یە، هاوەو شۆکردنی بنکە شۆڕشگێڕی‌یەکانی رووسیا، نەفرەت لەزولمو ستەمی رووسیان لەنێودا ئەستوورو هۆکارێکی یارمەتیدەری پێکهاتنی ناسیۆنالیزمی تەتەریش بوو.

ئاگایی لەنێو تەتەرەکانی رووسیاو شوێنەکانی دیکە بەبزووتنەوەیەکی ئەدەبی دەستی پێ‌کردو بەبەرهەمی زانایانی وەك شەهابەددین مەرجانی، عەبدولقەییوم نەسیری، ئیسماعیل گەسپەرینسکیو خێزانەکەی زەهرا خانم، برشتی پەیدا کردو رۆژ لەدوای رۆژ زیاتر دەگەشایەوە.

قۆناغی تازەی ئەدەبی‌ی تەتەر، بەناوی ئەدەبی «ئەیدیلی» لەساڵی ١٨٩٥ەوە دەستی پێ‌کرد، بۆتەیەکی ئەزموونی دروست کردو پان تورانیزمی تێدا خولقاند. لەم سەردەمەدا، ژمارەیەکی زۆری نووسەرو شاعیر تێ‌دەکۆشان ئەو شتەی پێی دەگوترێ «هەستی نەتەوایەتی- نەژادی»)، بەتایبەتی کە دوای شۆڕشی ١٩٠٥ی رووسیا، بەبڵاو کردنەوەی بەرهەمی میللیو نیشتمانی پەرەی گرت، بورووژێنن. ئەو بەرهەمانە هەموو شتێکیان گرتبووە خۆ، ئایینیو شیعرو چیرۆکو شانۆگەریو مێژوو زمانەوانی. (ئەیاز ئیسحاقوف)ی پەخشان نووسو تەگایفی شاعیر، باشترین نوێنەری ئەو قۆناغە ئەدەبی‌یەن.

لەنیوەی دووەمی سەدەی نۆزەدا، رۆژ هەڵاتناسی ئەورووپایی‌و رووس وەك فامبری، فون لوکوکو رادلۆف، قوتابخانەی تورکناسی‌یان دروست کرد، تۆژینەوەو لێکۆلینەوەکانیان دەربارەی رەگو رەچەڵەك، پەیوەندی خزمایەتی، مێژووی زمانو زاراوە تورکی‌یەکانو شارستانیەتی کۆنی نەتەوەکانی تورانی، مەیلێکی نوێ بوو بۆ چالاکی رۆشنبیرانی تەتەر کە خولقێنەری ئەم بزووتنەوەیە بوون. ئەو ئامانجەی ئەوانی بەیەکتر پەیوەست دەکرد «یەکێتی نەتەوە هاو خوێنەکان بوو کە لەژێر زولمو ستەمی رووسەکاندا بوون». هەروەها نوێ کردنەوەی شانازی‌یەکانی رابردوو.

زۆربەیان پان تورانیستی بەباوەڕ بوونو ئیمپراتۆریەتی عوسمانییان بەرێبەری سروشتی بزووتنەوەکە دەزانی.

بەم شێوەیە، ئەدەبی «ئەیدیلی»، بزافێکی سیاسی لەنێو دیارترین کەسایەتییە رۆشنبیرییەکانی تەتەر دروست کرد: زیائەددین کەمالی، حەلیم جان ئەرجوف، قەدری ئیشی، موسا بیکوف، عەینەددین ئەحمەدوف، کەریموف، مەقسودوف، ئەحمەد ئورمانیف، شاکرو زاکر رایموفو یوسف ئاقچۆرا. ئەوان لەدەوری رۆژنامەی (ییلدیز) کە لەلایەن مەقسودوفەوە دەردەچوو، کۆبوونەوەو تێکۆشان ئاستی زانیاری رۆشنبیران بەرز بکەنەوەو ئامانجەکانی پان تورانیزم بلاو بکەنەوە.

دیارترین کەسی ئەم گروپە یوسف ئاقچۆرا یەکەمین تیئوریسین بوو، لەلایەك پان تورانیزمی وەك تێزێکی سیاسی خاوەن بەرنامە داڕشتو لەلایەکی دیکەش، لەرێی جێبەجێ کردنیدا تێکۆشا(٢).

ئاقچۆرا لەگوتارێکدا بەناوی «سێ سیستەمی سیاسی» کە لەگۆڤاری (تورك)ی چاپی قاهیرەی سالی ١٩٠٠دا بلاوی کردەوە، ئەو خەتە سیاسییەی دەبوایە لەو دەمەدا تورکان پەیرەوی بکەن، دیاری کرد. ئەم (مانیفێست)ە واقیعییەی پان تورانیزم.. لەبەشەکانی دیکەدا، وەختێ لەمەڕ دەولەتی جیهانیی تورك دەدوێین، شەنو کەو دەکەین.

لەقەفقاز، باکۆ گەورەترین نێوەندی گەلانی تەتەر، بووە کانگەی بزووتنەوە تورانیستییەکان. لەم شارەدا بوو کە بلاو کراوەی کاسپی (خەزەر) بووە ئۆرگانی نێوخۆی بزووتنەوەو دەمڕاستی پڕوپاگەندەی پان تورانیستی. لەو شارەدا، رێبەرانی وەك عەلی حسین زادەی خەلکی سالیان، ئەحمەد ئاغا ئوغلو خەلکی قەرەباغو عەلی مەردان تۆپچی باشییف بەیارمەتی ماددی گەورەی زیائەددین تازەئۆفو چەند کەسێکی تر لەسەرمایەدارانی تەتەر بنچینەی رێکخراوێکیان دامەزراند کە دەبوایە لەپیلانێکی بەرفرەدا بەشدار بێ: هەول دان بۆ لەنێو بردنی ئەرمەنەکانی قەفقاز. ئەوان هەولێکی زۆریاندا تورکە ئازەرییەکان (لەقەفقازو سەرووی رۆژئاوای ئێران، بێگوێدانە ئەو جیاوازی ئایینییەی شیعەو سونییان لێك جودا دەکردەوە، بەئامانجەکانی یەکێتی ئیسلامو پان تورانیزمەوە بلکێنن. بیرو باوەڕە رەگەزپەرستیو ناسیۆنالیستانەکەیان کە لەلای خەلکی رەشو رووت رۆشن نەبوو لەهەندێ کاتدا دەبوونە دروشمی ئایینیو مەلاکان لەسەر مینبەری مزگەفتەکاندا دەیانگوتەوەو کۆمەلانی خەلکیان لەدژی «کافرە بێزراوەکان»و «زالمە گەورەو گچکەکان»ی رووسو، ئەرمەنو، گورجییەکان دەورووژاندو ئومێدیان بۆ رزگار بوون لەدەستیان بەلوتفو بەزەیی خەلیفەی بەهێزی موسلمانان، سێبەری خوداو جێنشینی پێغەمبەر (د.خ) بوو.

دەربارەی نەوەی نوێ بەتایبەتی ئەو لاوانەی کەمو زۆر دەرسیان خوێندبوو، بلاو کردنەوەی ئەم ئایدیۆلۆژییە بەهۆی کتێبی مێژوویيو ئەدەبی بەرێوەدەچوو، نیشاندانی شانازییە کۆنەکانی خانو خاقانەکان، لاوەکانی هان دەدا تاخۆیان

بەخاوەنی دەوڵەتی عوسمانی، تەنیا دەوڵەتی (تورانی) جیهان بزانن‌و پێویستی هاوکاری لەگەڵ هەموو نەژادو نەتەوەکانی تورانی‌و ژیاندنەوەی ئیمپراتۆریەتی تورك‌و تەتەری فێر دەکردن.

پێشڕەوانی پان تورانیزم واتە تەتەرەکانی روسیاو قەفقاز، لەهەمان کاتدا گەلێکیان خۆ دەپاراست‌و مەیلی جیا بوونەوەو ئارەزووی یەکگرتن لەگەڵ تورکیای عوسمانی‌یان دەرنەدەخست. بەتایبەتی پێش شۆڕشی رووسیا، چالاکی‌یەکانیان لەچوارچێوەی رۆشنبیری ناوچەکانیاندا دەخولانەوە. خۆیان بەرەعیەتی وەفاداری تزار دەزانی‌و هەندێ جار دەیانزانی خۆیان بەسۆسیالیست نیشان بدەن تابتوانن بەو فێڵەوە سرنجی مەیلە توندڕەوەکان بۆ لای خۆیان راکێشن. لەلایەنی سیاسی‌یەوە، ئومێدیان بەتورکیا بوور بەردەوام نوێنەریان بۆ ئاستانە دەناردو داوایان لەدەستەڵاتدارانی عوسمانی دەکرد تارێبەری‌ی بزووتنەوەکە بەدەستەوە بگرن.

عەبدولحەمیدی دووەم بەرنامەی تایبەتی خۆی هەبوو. ئەو لایەنگیری یەکێتی ئیسلام بوور ئەو جۆرە بانگهێشتانە کە بنچینەکەی یەکێتی خەیالی نەژادی‌و، ئایینی نەبوو، هیچ کارێکیان تێ‌نەدەکرد. گومانی دەکرد ئەو کۆبوونەوە نەتەوەیی‌یانە تۆوی لیبرالیزمیان تێدا بێ، چونکە زۆری لێ‌دەترسا. بەناچار، سیاسەتەکەی زۆرتر لەسەر بنچینەی یەکێتی ئیسلام دامەزرا بوو، نەك یەکێتی‌ی تورکان‌و زۆرتر رووی لەجەزائیرو تونس‌و میسرو هیند بوو، نەتەتەرستان‌و تورکستان.

ناتوانین بەوردی بلێین کە لە چ کاتێکەوە مەیلی پان تورانیستی لەنێو نەتەوەکانی تورك‌و تەتەری رووسیادا دەستی پێ‌کردو لە چ کاتێکیشدا بووە تێزو بەرنامەی سیاسی جیدی‌و هەموو رەگەزە چالاکەکانی بەخۆوە گرت. بەلام لەهەمان کاتدا، ئەوە دەزانین، عەلی بەگی حسین زادە، پیاوی بەناوبانگو لێوەشاوەی بزووتنەوە لەسالی ۱۸۸۹دا بەناوی مامۆستای خوێندنگای پزیشکی سوپا چووە ئاستانە تا پان تورانیزم بلاو بکاتەوەو پروپاگەندەی بۆ بکا. هەمان کەس بوو کە پان تورانیزمی هێنا تورکیا. ئەنجامی هەوڵ‌و کۆششی سەرسەخت‌و بەردەوامەکانی، پێك هێنانی کۆمەڵەی پان تورانیست بوو هەرچەندە ئەندامەکانی کەمیش بوون، بەلام بوونە گەورەترین مامۆستاو رابەری پان تورکیزم‌و پان تورانیزم.

لێرەدا جێگای خۆیەتی لەشەڕی نێوان ئەرمەن‌و تەتەر یان وردترو بەپێوەرێکی بەرینتر لەهەوڵدان بۆ لەناو بردنی نەتەوەی ئەرمەن لەقەفقاز لەسالی ۱۹۰۵ بدوێین کە ئەرمەنەکان زۆر بەتووندی لەبەرامبەریاندا وەستان. لاوانی ئەرمەن کە بۆ بەرگری کردن لەئەرمەنەکانی دانیشتووی تورکیا لەبەرامبەر تورکانی عوسمانی‌و کوردان مەشقیان کرد بوو. توانیان ئەو پیلانەی لەلایەن ئازەری‌یەکانی قەفقازەوە رێكخرا بوو، دوای شەڕی زۆرو زیانی گەورە، تێك بشکێنن.

ئەم «رووداوە دلتەزێنەی نێوان نەتەوەکان»، پاشان بەدوورو درێژی لێ‌ی کۆڵرایەوەو بەڵگەکانی ئەم «شەڕی برا کوژی‌یە» تاوتوێ کران‌و دەرخران. هەندێك باسی «بۆرژوازی چەوسێنەری ئەرمەنی»و «پرولیتاریای چەوساوەی تورك»یان دەکرد.

هەندێکیش لەمەڕ «غەریزەی پیاو کوژیی تورکان»و «ناسیۆنالیزمی داگیرکەری ئەرمەن»و «بالا بوونی رۆشنبیری ئەوانو نەزانیو دەمارگیری موسلمانان» دوان. سەرەنجام بەرای هەموو لایەك ئەگەرەکانی خرانە ملی «شەیتان»یان حکوومەتی شەیتانیی تزار کە تاکتیکە کۆلۆنیالیستیی‌یەکەیان بەپێی «دووبەرەکی دروست کەو حکوومەت بکە» داڕێژرا بوو. بەم شێوەیە ئەم دوو نەتەوەیە وەك قوربانی «وروروژاندنی دەزگای دەستەلاتداریتی»ی رووس ناسرانو فایلە خوێناوییەکەیان داخرا. بەلام پاش ماوەیەك بەمەبەستی سەرژمێری زیانی ئەرمەنەکان کە گەلێ گەورە بوو، دووبارە کرایەوە.

ئەگەرچی هۆکارەکانی سەرەوە (جگە لەهۆکاری درۆی چەوسانەوەی ئابووریو ناسیۆنالیزمی داگیرکەر) واقیعی بوون، بەلام پلە دوور بوون. تۆژینەوەی بزافی پان تورانیزم، رێگامان پێ‌دەدا کە ئەم قۆناغە «مەتەلە»ی نێوان ئەرمەنو تەتەر لەبەر رۆشنایی رووناکی‌یەکی نوێ وە ببینینو سەرەداوە نهێنی‌یەکانی بدۆزینەوە.

ئەم قۆناغە هاوکاتی شەڕی رووسو ژاپۆن بوو. رووسیا لەبەرەی رۆژهەلاتی دووردا سەرگەرمی شەڕ بوو. تێشکانە یەك لەدوای یەکو پڕ هەراو هۆریاکان، رووسیایان لاوازو کەم ئیعتبار کردبوو. ئەو هەلەی تەتەرەکان لەمێژ بوو چاوەڕێی بوون، هەلکەوتبوو. سەرکەوتنەکانی «ئامۆزای زەرد» واتە ژاپۆن، ئومێدەکانیانی بزوانبوو. کوشتاری ئەرمەنی‌یەکانی قەفقازی بەپێشەکی وەدی هاتنی نەخشەکانیان دەژمێردرا. بزافەکە لەسەرکەوتنی‌دا، دەیتوانی ببێتە یاخی بوونێك دژی رووسیا یان بەلایەنی کەمەوە ئەم «ولاتەی تورکان» لەئەرمەن پاك بکەنەوە کە خۆیان بەماخۆی لەمێژینەی ئەوێ دەزانینو بالا دەستی‌یەکەیان بۆ هەمیشە تێکبشکێنن.

ئازەری‌یەکان بۆ ئەم داهێنانە جەسوورانەیان داوای یارمەتی‌یان لەتورکیا کرد. چاوەڕوان بوون هەر نەبێ یارمەتی ناراستەوخۆو دزەکی یان پێ‌بگا. بێگومان ئەو رێکخراوە پان تورانیستانەی لەئاستانە دامەزرا بوون، بەدوعای خێرو دەستگیرۆیی لێپرسراوانی دەولەتی، پارەو چەکیان بۆ ناردن. ئەمما داهێنەرو داڕێژەری ئەم نەخشەیە، باکۆ بوو، لەم شارەدا، عەلی بەگی حسێن زادە (کە لەکاری ئاستانەی گەڕابۆوە) بەهاوکاری ئەحمەدی ئاقاییفو تۆپچی باشییف بنکەی خۆیان پێکهێنا بوو، کارەکانیان داڕشتبوو لەکاتی خۆی‌دا جێ‌بەجێ‌یان کرد بوو. بەتایبەتی تورکانی شیعەیان بێ‌خۆ تێ‌گەیاندنی سونی‌یە غەیرە تورکەکان، مەشق دابوو،و پڕ چەکیان کردبوون. بەو پێ‌یەی گفتی یارمەتی‌یان لەئازەری‌یەکانی ئێرانیش وەرگرتبوو. لەئاکامدا بەهێمایەك کە هەموو چاوەڕوانی بوون. شەڕ لەباکۆ دەستی پێ‌کردو پاشان بۆ نەخچەڤانو یەریڤانو شوشێو گەنجەو تفلیس تەشەنەی کرد. ئەم رووداوانە کە کەمێك بەر لەشۆڕشی ١٩٠٥ قەومان، هەژدە مانگی خایاندو لەسەرتاسەری قەفقازدا دووبارە دەبوونەوە. لەهەموو شوێنەکاندا، چینی هەلبژاردەی تەتەر، پەیڕەوکەری ئایدیۆلۆژی پان تورانیزم بوون. کۆمەلانی خەلك گوێیان

لەبانگی سرنج راکێشی شەڕو تالآن، رادەگرت.
دەوڵەتی رووسیا لەو هەلە دەگمەنەی کە دەیتوانی بەتیرێك دوو نیشان بشکێنێ‌و دوو نەتەوەی ئەرمەن‌و تورك بکەونە شەڕەوەو یەکدی بکوژن‌و مەیلی سەربەخۆیی یەکدی بەدەستی یەکتر سەرکوت بکەن، زۆر خۆشحاڵ بوو. جگە لەمەش نەك هەر هەڵوێستێکی وەك (پونتیوس پیلاتوس)ی لەخاچ دانی حەزرەتی مەسیح نیشاندا، بەڵکو نەخشێکی ورووژێنەریشی خستە ئەستۆو سەرەنجام بەناردنی هێزە سەرکوتکەرەکانی، کۆتایی بەتاوانو خوێن ڕشتن هێنا. بەڵام گورجی‌یەکان کە حەزیان دەکرد سرنجی تورکان بۆ خۆیان راکێشن‌و حەسوودی‌یان بەئەرمەنەکان دەبردو ناسیۆنالیزمی توندڕەوی خۆیان لەژێر پەردەی وشەی بریقەداری سۆسیال-دیموکراتدا شاردەوە، کاغەزی بێ‌گوناه بوونی تاوانبارو سزادانی قوربانی‌یان، مۆر کرد.
بەدبەختی‌یەکی تورکان ئەوە بوو، ئەرمەنەکانی قەفقاز، بەپێچەوانەی ئەرمەنەکانی تورکیا، چەکدارو مەشق پێکراو بوون. سوپای رووسیا ئەوانی بەچەك ئاشنا کرد بووو بزووتنەوەی شۆڕشگێری ئەرمەنیش فێرە بەکارهێنانی کردبوون. لەپێناوی داکۆکی کردن لەخێزانەکانیان لەیەریفانەوە تاتفلیس‌و بەرزایی‌یەکانی ئێرتساخ‌و قەرەباغ (بەتایبەتی زینوی عەسکەرۆف) ئەرمەنەکان بەسەر سەختی بەرگرییان کردو هێرشکەرەکانیان پاشەکشێ پێکرد.
لەنێو نەتەوە تورانی‌یەکانی رووسیادا، تەتەرەکانی قەفقاز لەوانی دی پێشکەوتووترو ئازاترن. خەڵکی وڵاتانی ئەودیوی خەزەر ئۆزبەك، قەرغیز، تورکمەن‌و ئەوانی دی لەبن کاریگەری دوو بنکەی رۆشنبیری تەتەر واتە قازان‌و باکۆدا بوون. لەو کاتەوە تەتەرەکان سیاسەتێکی زیرەکانەیان گرتەبەرو هێواش هێواش تورانی‌یەکانی ئاسیایان وەگەڵ بیروباوەڕەکانی خۆدا.
لەیەکەمین مانگەکانی ١٩٠٥، واتە رۆژانی بەر لەشۆڕشی رووسیا، هەلێك بۆ نەتەوە تورانی‌یەکانی ئیمپراتۆری هەڵکەوت کە «کۆنگرەی موسلمانان» پێك بهێنێ‌و لەوێدا بۆ یەکەمین جار نوێنەرانی هەموو نەتەوە تورانی‌یەکانی رووسیا- قرم، قەفقاز، سیبری، تورکستان، ئوفا، ئورنبورگ، سینبریسك، قازان- بەشدار بوون. بەمەبەستی خۆلادان لەتەنگ پێ‌هەڵچنینی پۆلیسی تزاری، شوێنی بەستنی ئەم کۆنگرەیە، بازاڕی ساڵانەی (نیژنی-نوفگورود)و مانگی ئاب، دانرا. لەناو کەشتی‌یەکی رووباری فۆلگا کە بۆ ئەم مەبەستە بەکرێ‌گیرا بوو، چەند سەت نوێنەر لەمەلار بەگو بازرگان‌و رۆشنبیر لەیەکەمین کۆنگرەی موسلمانەکانی رووسیادا، کۆبوونەوە.
لەمانگی ئۆکتۆبەردا کە شۆڕش دەستی پێ‌کرد، هەستی ناسیۆنالیستی لەنێو نەتەوە ناوبڕاوەکاندا ورووژاو پان تورانیزم وەك بزافێك کە ئامانجی یەکێتی‌ی نەتەوە هاونەژادەکان بوو، جێ‌ی خۆی کردەوەو لەجاران زیاتر جێگیر بوو.
ئەنجوومەنی دۆما، کۆنگرەی موسلمانان‌و چالاکی‌یە جۆراوجۆرە نوێ‌کان، مۆڵەتێکی بەگرووپە هەمە رەنگەکانی تورانی‌دا تا یەکدی بدۆزنەوە، نەخشەکانیان

نیشان دەنو هەولیان لەرێی ئامانجە هاوبەشەکانیاندا، یەکخەن. هەلبژاردنی ئەنجوومەنی دۆما، باشترین بواری ئاژاوە نانەوەی بۆ ئەوان رەخساند، وە دواخستنی هەلبژاردن کاری نەکردە سەر چالاکی‌یەکانی بزووتنەوەکە: کۆنگرەی موسلمانانی رووسیا کە بەردەوام پێك دەهات لەواقیعدا بوبووە پەرلەمانی پان تورانیستەکان.

دووەمین کۆنگرە کە لەسالی ١٩٠٦ لەپترزبۆرگ پێك هات لەلایەن پۆلیسەوە بلاوەی پێ‌کرا. دوای کەم ماوەیەك، سێیەمین کۆنگرە لە (ماکاریا)ی نزیك (نیژنی-نوفگورود) دەستی بەکار کرد. لەم کۆنگرەیەدا، نزیکەی (٨٠٠) نوێنەر بەشدار بوونو سەرۆکایەتی‌یەکەی درا بووە دەست (تۆپچی باشیف)ی رێبەری سیاسی‌و پان تورانیستی بەناوبانگی قەفقاز. بەرنامەی کاری دانیشتنەکان بەپلەی یەکەم دەژمێردران. لەبەرئەوەی دەولەت ئیجباری بوونی خوێندنی زمانی رووسی لەخوێندنگا ئیسلامی‌یەکاندا هەلوەشاند بۆوە، کۆنگرەش بەرنامە گشتی‌یەکانی خوێندگاکانی نەهێشت.

بەلام زمانی نارچەیی ئیجباری بۆ هەمووان، دەبوو چ بێ؟ زمانی تەتەرەکان؟ زمانی قەرغیزەکان یان زمانی تورکی (تورك ئوردو)؟و خوێندنگا ئیسلامی‌یەکان لەسەرتاسەری رووسیادا دەبوو لەسەر چ سیستەمێك بەرێوە بچن؟ لەبەر هەندێ کۆنگرە بریارێکی‌دا، هەرچەندە بەرووکەش بەرۆشنبیری دادەنرا، بەلام لەراستی‌دا بەقوولی سیاسی بوو: زمانی تورکی کردە زمانی میللی هەموو کۆمەلگا ئیسلامی‌یەکانی رووسیاو سیستەمی دەرسی لەئیمپراتۆریەتی عوسمانی‌یەوە وەرگرت. بێجگە لەمەندێش، بەرنامەیەکی سیاسی نووسی کە لەراستی‌دا بەبەرنامەی خەبات لەرێگای ئازادی دەژمێردراو ئیدیعای دەکرد، نیشاندەری «ئامانجو ئارەزووەکانی» بیست ملیۆن موسلمانی رووسیایە.

لەئەنجوومەنی نوێی دۆمادا، نوێنەرە تورانی‌یەکان ئەم بەرنامەیان تەسلیمی پەرلەمانی ئیمپراتۆری کرد. دەولەتی تزاری بەمەبەستی کەم کردنەوەی دەسەلاتی تورکو تەتەر لەدۆمادا پەنای بردەبەر دانانی پەیرەوێکو بەگۆرینی یاسای هەلبژاردن، ژمارەی نوێنەرە موسلمانەکانی کەم کردەوە. بەم شێوە مافی را دەربرینی لەپازدە ملیۆن تورکی دەشتەکانی تورکستانو قەرغیزستان، واتە لانکی مێژوویی (تورانیان) زەوت کردو لەسێیەمین دۆمادا لەباتی (٤٣) نوێنەر تەنیا (١٠) نوێنەری تورانی، ئامادە بوون.

هۆکاری دیکەش لەپەرەگرتنی ئەم «ناسیۆنالیزم»ە نەژادی‌یەدا، دەوریان هەبوو: لەئەنجامی شۆرشی ١٩٠٥دا، زانکۆی قازانو رۆژنامەو کتێب زنجیرەکانیان پچراندبوو. گرنگترین ئەو رۆژنامەو گۆفارانەی لەباکۆو قازانو بنکەکانی تری تورکو تەتەرەوە دەردەچوونو ژمارەیان دەگەیشتە (٥٠)، ئەمانە بوون:

لەباکۆ:

(حەیات) بەسەرپەرشتی ئەحمەدی ئاقاییفو عەلی حسین زادە.

(تازە حەیات)و (صەدا) بەسەرپەرشتی هاشم بەگ.

(ئیرشاد)و (تەرەقی) بەسەرپەرشتی ئاقاییف.
(حەقیقەت)و (ئیقبال) بەسەرپەرشتی (ئەروجوف).
(فیوضات) بەسەرپەرشتی حسین زادە.

بلاو کراوەکانی ئاقاییفو حسین زادە، زۆربەیان لەلایەن سانسۆری تزارییەوە دەوەستانو پاشان لەژێر ناوونیشانی دیکەدا بلاو دەبوونەوە. پارەکەیان (تازەئوف)ی ملیۆنێری باکۆیی، دەیدا. ئەو بلاوکراوانە دەورێکی بالایان لەپەروەردەکردنی (ناسیۆنالیزم) لەئازەربایجانی قەفقازو پەرەگرتنی پان تورانیزمدا، گێڕا.

لەقازان: رۆژنامەکانی (بیلدیز) بەسەرپەرشتی (مەقسودوف). (تەنگ)و (تەنگ بیلدیز)و (بەیان ئەلحەق) بەسەرپەرشتی (عوسمانوف)و ئەوانی دی، بلاو دەبوونەوە. بلاوکراوەی ناوبەناویش لەتەفلیس، قەرم، پترزبۆرگ، ئۆرنبۆرگ، تومسك، هەشتەرخانو شوێنەکانی دی دەردەچوون، هەموو ئەو بلاوکراوانە بەزمانی تورکی ئەستەمبۆلی دەردەچوونو ئەدەبی عوسمانی‌یان بلاو دەکردەوەو پێش هەموو شتێك پروپاگەندەیان بۆ دەستەلاتی ئەوان دەکرد.

ئەو چالاکی‌یە رۆشنبیریو سیاسی‌و پروپاگەندەیی‌یەی لەدەورو بەری سالی ۱۹۰٦دا لەلایەن پان تورانیستەکانەوە بەڕێوەدەبران، ئاکامی باشی لێ وەردەگرت. بەشێوەیەك (فامبری)ی رۆژهەلاتناسو تورکناسی بەناوبانگی هەنگاریایی دوای سەفەرێکی لێکۆلینەوە بۆ ئاسیای ناوەڕاست نووسی:

«رەعیەتە موسلمانەکانی تزار یەك دروشمیان هەیە: یەکێتی... هەولی سەرەکی تەتەرەکان بەرەو یەکێتی‌یەکی پتەوی نێوان لقە جۆراوجۆرەکانی خێزانەکانی تورك نەژادە».

(بلاو کراوەی «سەدەی نۆزدە» ژمارەی حوزەیرانی ۱۹۰٦).

دوای نیو سەدە هەولی لایەنگرانی یەکێتی‌ی ئیسلامو پان تورانیزم، هەستێکی بەهێزی هاوکاری لەنێو (رەعیەتە موسلمانەکان)ی تزاز خولقا بوو، هەستی یەکێتی نەتەوەیی‌و ناسنامەی هاونەژادی کە صەدری ناظم ئوغلو (مەقسودوف) نوێنەری قازان لەدانیشتنێکی بەهەراو هۆریای ئەنجوومەنی دۆمای سالی ۱۹۰۹دا خستی‌یە روو، پوختەی ئەم هەولانە بوو.

(مەقسودۆف) دوای ئەوەی دژی «رەگەزپەرستی‌و بێبەش کردنی ملیۆنان هاونیشتمانی تورکستانو قەرغیزستان لەمافی دەنگ دان» نارەزایی دەربڕی، گوتی: «ئێمە یەك ئایینو یەك ناسنامەی هاوبەشمان هەیە، ئەو دوو شتەش بۆ ئێمە بایەخیان هەیەو سوورین کە دیفاعیان لێبکەین؟». «دەستەلاتدارانی ئەم ولاتە دەبێ لەم داوایەمان بگەن». ئامانجتان چی‌یە؟ ئایا هێشتا دەتانەوێ ئێمە لەئۆقیانوسی رووسی‌دا نقووم بکەن؟»و قسەکانی بەرستەیەك کۆتایی پێهێنا کە لەواقیعدا راگەیاندنی شەڕی پان تورانیستەکان بوو لەگەل رووسیا: ئومێدەوارم ئێمە ناچار نەبین لەپێناوی ئایینمان، ناسنامەو زمانمان بجەنگین.. ئێمە مەیلی جیا بوونەوەمان نی‌یە، بەلام ئەگەر ئەو مەیلەمان لەلادا بخولقێ، ئەگەرەکەی لەئەستۆی ئێوەدا دەبێ»

ئەمما تەنیا هەرەشە بەس نەبوو. بنچینەی داواکاری «بیست ملیۆن موسلمان» کە مەقسودۆف باسی لێوە دەکرد بۆ وەرێ خستنی بزووتنەوەیەکی جیاوازیخواز بەس نەبوو. هەروەها بۆ چالاکی بەکۆمەڵی یاسایی ڕێکخراوێکی سیاسی-عەسکەری کە هەموو نەتەوە تورانییەکانی رووسیا بگرێتەوە پێویست بوو. ئەم کۆمەڵگا نەتەوەییە فراوانە، دەبوایە بتوانێ لەسایەی ڕێکخراوێکی عەسکەری توندو تۆڵدا بیرو باوەڕەکەی دەربخاو ئێستاش دامەزراندنی ڕێکخراوێکی وا زۆر زەحمەت بوو. کۆمەلانی خەلکی نەتەوە تورانییەکان لە «سر بوون»دا رووچوو بوون. رووسیا کە تازە لەشەڕی رۆژهەلاتی دوورو هەژانی شۆڕشی ناوخۆ ڕزگار بووبوو، هێواش هێواش هێزە ناقۆلاکەی رابردووی بنیات دەناوەو بێگومان لەترسی ئەم گوشارە رۆژ بەرۆژ زیاترەدا، پێبەپێ کۆنەپەرستانەترو سەختگیرترو سەرکوتی چالاکییە سیاسییەکانی لەهەموو لایەنێکیشەوە، زیاتر دەکرد.

لەبارودۆخێکی وادا، پان تورانیستەکان جگە لەوەی جارێکی دی بەرەو دنیای دەرەوە بڕوانن و پەنا وەبەر دەولەتی تورانی هاوسێی خۆیان ببەن، چارەیەکی دیکەیان نەبوو.

لەو کاتەدا ئاسۆیەکی دلخۆشکەر لەبەرامبەریاندا، ئاوەلا بوو. (عوسمانی)ی برا گەورەیان هەنگاوی بەرەو قۆناغی ڕێنیسانس دەنا. رژێمی دەستووریی عوسمانی پێداویستی نوێی دەخستە بەردەستی بزافی پان تورانیستەکان. لەبەر هەندێ، دەزانین کە بۆچی ئاقچۆرا، ئەحمەدی ئاقاییف، عەلی حسین زادەو ئیسماعیل گەسپەرینسکی ڕێبەرانی ئەم بزووتنەوەیە یەك لەدوای یەك بەرەو ئاستانە وەرێ کەوتن و لەوێ نیشتەجێ بوون.

١. لەراستیدا، ئەم جۆرە (پان تورانیزم)ەش مۆرکێکی سیاسییانەی گرتبوو، وە بیرمانە کە ئەم تورك پەرستییە ئاشکرایە وێڕای نەفرەت لەرووسەکان لەماوەی جەنگی تورکیا-رووسیا (١٨٧٧) لەنێو هەنگارەکان پەیدا بوو. دیاردەیەکی بەرچاوتر، سیاسەتی بولغارەکان لەجەنگی یەکەمی جیهاندا، خۆ دانە پاڵ هەنگاریاو عوسمانی، دژی رووسیا بوو. ساڵێك بەر لەشەڕێ کۆنگرەی پان تورانیستەکان کە لەئاستانە پێك هات، نوێنەرانی ئەو دوو وڵاتەش بەشدار بوون، روانگەی یەکێك لەڕێبەرانی بولغاریا دوای بەسترانی کۆنگرەی (بوخارست)یش جێگای سرنجە: «بەهۆن ناومان ببەن، بەتورك و تەتەر ناومان ببەن ئەمما نەڵێن «رعسەن» لەساڵانی شەڕدا یەکێتیی گومرگی ئەم سێ وڵاتە تورانییە رە سە نە ، باسی لێوەکرا.

٢، یوسف ئاقچۆرا: نووسەرو ڕێبەری سیاسی لە (ئەیدیل)ی ناوچەی فۆلگا لەدایك بووە. خوێندنی لەئاستانەو پاشان لەپاریس تەواو کردووە، لە ساڵی ١٩٠٤ بووە ئەندامی حزبی (کادیت)ی رووسی، لەگەڵ (ئەیاز ئیسحاقوف).

لە.١٩٠٨ وەك پەیاعنێری رۆژنامەی (وەقت)ی چاپی (قازان) چووە تورکیاو لەوێ مایەوەو هێواش هێواش بووە دامەزرێنەرو تیئوریسیۆنی پان تورانیزمی سیاسی.

.. وشەی تەتەر زاراوەیەکی ناڕاستە کە بەئێرانییەکانی دانیشتووی باکۆو دەربەندو شێروان گوتراوە. (و.ف)

# پان تۆرانیزم

# لەتورکیا تا دەستوریی عوسمانی

لەسالآنی ۱۹۰۰دا، پان تورانیزم بوو بووە بیروباوەڕێکی سیاسی تەواو پوخت لەمێشکی ڕێبەرانی تورکو تەتەری رووسیا. بڕیارەکەی ئەوانمان لەبیرە کە لەکۆنگرەی (نیژنی نوفگورود)ی سالی ۱۹۰٦دا زمانی تورکی ئەستەمبۆلی‌یان کردە زمانی گشتی پان تورانیستەکانو سیستەمی دەرسیی عوسمانی‌یان لەلای خۆیاندا، بەکار هێنا، هەروەها وەبیرمانە لە: سەکۆی ئەنجوومەنی دۆما قسەیان لەمەڕ (ناسنامەی نەتەوایەتی) هەندێ نەتەوە دەکرد کە تا ئەو سەردەم ناویان بەموسلمان دەهاتو ئەگەر داواکاری‌یەکانیان پشت گوێ بخرێن، هەڕەشەی جودا بوونەوە دەکەن.

جێگای سەرسوورِمانە کە لەماوەی ئەو گۆڕانکاری‌یانەدا، هێشتا لەخودی تورکیادا بزووتنەوەی پان تورانیزم نەبوو. هەرچەندە لێرەو لەوێش مەسەلەکە خۆی دەردەخست، لەسالی ۱۸٤۲، (فون مولتکە Von Moltke) فەرماندەی ئەلمانی (کە پاشان بووە سەردارێکی بەناوبانگ)و ئەو دەم سەرهەنگو مەشق دەری لەشکری عوسمانی بوو، بەدەستەلآتدارانی ئاستانە پێشنیاری کردبوو کە پان تورانیزم قبوڵ بکەن، واتە لەباتی روانین بەرەو ئەوروپا، ئاسیا لانکەو ولآتی ملیۆنان تورانی لەبەرچاو بگرنو ئەوان لەکۆمەڵەیەکی بەرفرەدا یەکخەن. هەروەها پێشنیاری کردبوو کە پایتەختەکەیان لەئاستانەوە بگوزانەوە (قونیە)و تا ئەوپەڕی رۆژهەلآتیش. بەم شێوەیە ئیمپراتۆریەتی عوسمانی دەیتوانی لەهەلو مەرجێکی لەبار تردا سروشتی بگۆڕێو چاك بکرێ.

بەلآم سولتان عەبدولحەمید (۱۸۳۹-۱۸٦۱)و بابی عالی سەرگەرمی گیروگرفتە نێوخۆیی‌و دەرەکی‌یەکان بوونو نەکاتو نەتوانایان هەبوو رێبازێکی نوێ بگرنەبەر. ئەم قۆناغە، هاوکات بوو لەگەڵ دەستەلآت پەیدا کردنی ئیلچی‌یەکانی(*) ولآتە گەورەکانی ئەوروپایی کە دەستو پێی بابی عالی‌یان بەستبوو.

ئەودەم، هێشتا تێشکانە گەورەکان لەرۆژئاوا تووشی عوسمانییەکان نەبوو بوون، کە بەرەو روژهەلاتی تورانی وەرگەڕێن. بەپێچەوانەوە، ئەوان تازەکاری ئەورووپی کردنو ریفۆرمی رۆژئاواییان دەست پێ کردبوو، بەهەر حاڵ، ئەم مەسەلەیە سرنج راکێشە کە (ئارمینیوس فامبری)ی رۆژهەلاتناسو تورکناسی بەناوبانگ (کە پێشتر ناوی هاتووە) لەساڵی ١٨٥٦دا، کاتی تێپەڕ بوونی لەئاستانەوە بەرەو رۆژهەلات، بەسەر سووڕمانەوە، لە بێ ئاگایی ئەفەندییەکان دەربارەی واقیعیەتی نەژادی ئەو نەتەوانەی کە لە بوداپشتەوە تالیوارەکانی ئۆقیانووسی گەورەدا دەژین، گەیشت. لەروانگەی ئەواندا ئەو نەتەوانە دڕندە بوون. یەکێك لەپاشا وردبینەکان کە لە قسەکەی فامبری رەنجاو بوو، پێی گوت: (ئێوە نابێ ئێمە لەگەڵ قەرغیزو بیابان گەرە بێشارستانیەتەکانی تەتەرستان بەیەك چاو تەماشا بکەن)«١».

نەوەی تازە لاوی ئەو سەردەمە تیوری ژیوپۆلیتیکو ئامانجی (پان عوسمانی) یان هەبوو کە خەتی (هومایۆنی گولخانە)«٢» بنچینەکەی داڕشتبوو.

تا ئەو دەم (نەتەوەی فەرمانڕەوا) جگە لەناوی (میللەتی موحەممەد «د.خ») شتێکی دیکە نەبوور مەسیحییەکان کە (رەعیەت)یان پێ دەگوترا، بەپێی هەمان فەرمانی کۆمەلاتی۔ ئایینی پێکهاتی تایبەتییان هەبوو. عوسمانییەکان بەگشتی، لەوەی دەسەلاتیان بەسەر (رەعیەتەکان)دا هەبوو، دەیانچەوساندنەوە، دلخوش بوون. ئەوان نەهەستو نەرۆشنبیرییەکی نەتەوەییی تایبەتی یان هەبوو، بۆیە هەولیان نەدەدا نەتەوە ژێر دەستەکانیان بکەنە تورك.

نووسەرانی تورك وەبیریان دێناوە کە (باج)ی کۆمەلگای ئایینی مەسیحی کە ئەوانی لەموسلمانان جودا دەکردەوەو دیواری نێوان خەلکە تێکەلاوەکانی کۆمەلگای عوسمانی دابین دەکرد، زۆرتر پەردەی پاراستنی تورکان بوو لەبەرامبەر رۆشنبیری مەسیحییەکانو یەکسان بوونی تورکان لەگەلیاندا. بەلام ئەو ریفۆرمانەی دوا بەدوای (تەنزیمات) کران ـ لەبوارەکانی عەسکەری، ئیداری، پەروەردە، قەزاییو هتد ـ واقیعیان سەرەو ژێر کرد. نەوەیەکی نوێی عوسمانی (تورك لەنێو ئەوانی دی) کە لەبنکە گەورەکانی رۆشنبیری رۆژئاوا بەتایبەتی پاریس، خوێندبوویان، گەڕانەوە ئاستانەو ئامانجە ئازادیخوازییەکانی ئەورووپای سەدەکانی ١٨و١٩یان لەگەڵ خۆیان هێناو بەهۆی چاپەمەنیو شانۆ (کە لەلایەن ئەرمەنەکانەوە بنیات نرابوو) کەوتنە بلاو کردنەوەی. خوێندنگاکانی (حەربیە) (بەدریە)، (توببیە)و فێرگەی مامۆستایانی (گالاتا سەرای)و ئەوانی دیکەش لەو کارەدا بەشدار بوون. بۆ یەکەمین جار بیری ولاتیکی واقیعی لەسنووری واقیعەتدا نیشانی لاوانی عوسمانی درا.

دیارترین کەسی سیاسی ئەم قۆناغە رەشید پاشا (١٨٢٤ـ١٨٧٦)و مەدحەت پاشا (١٨٢٢ـ١٨٨٤) بوون. دەزانین کە ئەوەی دوایی بەیارمەتی (گریگور ئودیان Krikor Odian ) یەکەمین دەستووری عوسمانی نووسی. دیارترین کەسی ئەدەبیاتیش دیق کەمالو ئیبراهیم شناسی بوون. ئەوەی دوایی داهێنەری یەکەمین هەولدانە بۆ چاککردنی زمانی تورکی کە بەناوی (شێوازی نوێ) ناسراوە.

پێشنیارەکەی ئەو ئەوە بوو: زمانی تورکی لەژێر کاریگەری عەرەبیو فارسی رزگار بکاو رستەو وشەی تورکی بەکار بهێنن. نامیق کەمال کە شاگردی ئەوبوو، بەیەکەمین شاعیری میللی تورکیا دەناسرێ، کەسێ کە شیعری لەمەڕ ئامانجە نەتەوەییو شانازییەکانی، نووسیوە، دەڵێ: «ئێمە لەنەژادێکی رەسەنین. لەهۆزێکەوە دەستمان پێ کردو ئیمپراتۆریەتێکمان بنیات نا».

دوای شۆڕشی دەربار لەساڵی ١٨٩٧، قۆناغی کۆنەپەرستیی سولتان عبدالحمیدی دووەم دەستی پێ کرد کە بزافی تازەی ئازادیخوازی پێ بەپێ خنکاند. ئەو بزافە کاری نهێنی بەشێوەی دەستە دەستەی بچووك دەست پێکردو پەنای بۆ دارو دەزگای فێرکردنی باڵا برد یان گوێزایەوە دەرەوە تاخەبات لەوێ را درێژە پێبدا.

لەگەڵ هەندێش، ساڵانی سەرەتایی حوکمرانی عەبدولحەمید ئەوەندە سەخت نەبوونو نەتەوە پەرستی لیبرالی لەداو دەزگا زانکۆییەکاندا هەر لەبرەو دابوو. لەو کاتەدا بوو کە بزووتنەوەی، تورکچێتی بەفیکری چەند زانایەكو بەپێی تایبەتمەندییەکانی (میللەتی عوسمانی) داڕێژرا. ئەحمەد وەفیق پاشا نووسەری دیکسیۆنەری (زاراوەی عوسمانی)و ژەنەراڵ سلیمان پاشا پشکنەری گشتی خوێندنگا عەسکەرییەکانی ئاستانە، بەبابی (پان تورکیزم) دەژمێردرێن. ئەو دووانە لەژێر کاریگەری (مێژووی گشتی هۆنەکان)ی نووسینی (دوگین) دابوونو زانیاریو ئیلهامیان لەو کتێبە وەرگرتبوو.

وەفیق پاشاو سلیمان پاشا کە یەکەمیان لەزانکۆی عوسمانیو ئەوی دی لەکۆلیجی ئەفسەری ئاستانەدا، دەیانخوێند، هەستی نەتەوایەتی ـ نەژادی یان لە کن نەوەی نوێدا واگا هێنا، خوێندکارەکانیان فێر کرد کە نەژادیان تورکە نەك عوسمانیو زمانیان تورکییە نە (زمانی عوسمانی).و مێژووو رەگو ریشەیان دەگاتەوە هۆنەکانو هیسونگ نون کە ناوی لەسالنامەکانی چینیدا هاتووە.

لەدووەمین قۆناغی حوکمرانی عەبدولحەمید، هەر وەك بینیمان پان تورانیزم کە لەرووسیاوە هاتبوو، بەهۆی سیاسییەکانی تەترەوە لەتورکیادا جێگیر بوو.

لەساڵی ١٨٨٩دا، عەلی بەگی حسین زادە«٣» کە مامۆستای کۆلیجی ئەفسەری بوو، چالاکییەکی چڕی دەست پێکرد. چامەی (توران)ی ئەو، بانگی پان تورانیزم بوو لەئاستانە کە هەستی بەشێکی نەوەی نوێی وروژاندو سرنجی بۆ ئەم بزافە نوێیە راکێشان. هێشتا هەشت ساڵ بەسەر بڵاو بوونەوەی (توران) تێنەپەڕیبوو کە (محمدامین بەگ)یش شیعرە بەناوبانگەکەی خۆی بەناوونیشانی (من تورکم) بڵاو کردەوە. ئەم دوو شیعرە زەمینەیان خۆش کرد گۆڕانکارییەکی زۆر گرنگ لەشێوازی بیر کردنەوەی تورکاندا پێشبینی بکرێ: گواستنەوە لەعوسمانییەوە بۆ تورکچێتی، لەنیشتمانپەروەری (دەوڵەتی)یەوە بۆ نیشتمانپەروەری (نەژادی)، رێرەوێك کە دەبوایە لەماوەی بیست ساڵی ئایندەدا تەواو بکرێ.

یەکێکی دیکە لەو کتێبانەی کە کاریگەری لەو گۆڕانکارییانەدا هەبوو

(پێشەکی‌یەك بۆ مێژووی ئاسیا) نووسینی (لیون کاهون) بوو (پاریس ١٨٩٦). ئەم کتێبە زیاتر لەرۆمان دەچوو نەك مێژوو، بەلاَم لەلای پان تورانیستەکان لەکتێبێکی زانستی بەنرخ تر بوو. چونکە بەشانازی‌یەوە لەجەنگیزخانو جێگاگرتنو نەخشەکانی بۆ دامەزراندنی ئیمپراتۆریەتێکی (جیهانی)ی مەغۆل، دەدوا.

لەبەر هەندێ لەساڵەکانی ١٨٩٠دا سێ رێبازی فیکری بۆ سرنج راکێشانی لاوانی زانکۆ رکابەری یەکدی‌یان دەکرد: یەکێك (عوسمانلی ئیتحاد)، ئەوی دی (ئیسلام ئیتحاد)و ئەوەی دوایش (تورك ئیتحاد) کە ئەو دەمی لەهەمووان لاواز تربوو. عبدالحمیدی دووەم هەموو نەتەوە پەرستەکانی (بێ جیاوازی) سەرکوت دەکرد، واتە لایەنگرانی ئیتحادی عوسمانی‌و ئیتحادی تورکان. ئەو خۆی لایەنگری یەکێتی‌ی ئیسلام بوو. ژمارەیەك پان- ئیسلامی سەرسەختی وەك (عەبدولهودا مونجیم)، (شێخ ئەسەد)و (موحەمەد زەفەر) لەدەورروبەری بوونو عبدالحمید خەونی یەکخستنی جیهانی ئیسلامو راگەیاندنی جیهادی لەبەرامبەر جیهانی مەسیحی دەبینی. دەیویست لەبەربەرستان (جەزائیر) تاهیندو لەفولگا تاعومان ئیمپراتۆریەتێکی گەورە دامەزرێنێ کە پێتەختەکەی ئاستانەو رێبەرەکەی خۆی بێ، خەلیفەو جێنشینی پێغەمبەری ئیسلام، بەم شێوەیە، قورئان تەنیا تەوەری ئامانجی عبدالحمیدی دووەمو تورکیای موسلمان دەژمێردرا.

لەساڵانی بەر لەراگەیاندنی دەستوور، پان تورانیزم لەتورکیادا زۆر لاواز بوو: چەند فەیلەسووفی وەك (نەجیب عاسم)، (ولید تاهیر)، (سامی)ی زمانەوانو ئەوانی دی کە خەریکی لێکۆلینەوەی تورکناسی بوونو چەند رۆشنبیرێکی پەراگەنەندەی خوێنەری کتێبەکانی فامبری، دوگینو کاهونو چەند رۆشنبیریکی تێکۆشەری تەتەر کە لەژێر پەردەی (ئیتحاد ئیسلام)دا چالاکی‌یان دەنواند.

ململانێ‌ی نێوان عوسمانلی‌یەکانو تورکچی‌یەکان لەدەرەوەی تورکیادا هەبوو. ئاقچۆرا بەبلاَو کردنەوەی گوتارێك بەناوی (سێ شێوە سیاسەت) لەگۆفاری (تورك)ی چاپی قاهیرەدا، بێتوانایی‌و لاوازی‌ی ئیتحادی ئیسلامو لایەنگرانی عوسمانیانی بۆ لاوانی تورك سەلماندو گەورەیی‌و شایستە بوونی پان تورانیزمی وەسف کرد. ئەو بیرو رای ریفۆرمستەکانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لەسەردەمی سولتان مەحموودی دووەم بەدواوە شەنو کەو کرد. لێرەدا هەوڵ دەدەین، تێزە بنچینەیی‌یەکانی، پوختە بکەین:

بەبڕوای ئاقچۆرا ئامانجی لایەنگرانی عوسمانی- واتە دامەزراندنی دەولەتێکی چەند نەتەوە -نموونەی ولاَتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا- تەواو ناراستە چونکە ئامانجی را:

ئەلف: لەگەڵ هەستو ئامانجی تورکاندا ناکۆکە، چونکە بەلادانی ئیمتازاتی نەتەوەی سەردەست، ئەوان لەریزی (رەعیەت)ەکان دادەنێ.

بێ: پێچەوانەی ئیسلامە، چونکە یەکسانی موسلمانانو کافران رادەگەیەنێ.

جیم: دژی دەرخستنی مەیلی نەتەوە ژێر دەستەکانە کە هاوژیانی دەستەلاَتداران

قبوڵ ناکەنو داواکاری سەربەخۆیین.

داڵ: دژی چاو تێبڕینەکانی رووسیایە کە ئامانجە جۆر بەجۆرەکانی لە پان ـ سلافیزمەوە بگرە تائامانجە مەسیحییەکانی، لەئیدیعای داگیرکرانی ئاستانەوە، هەڵدەقوڵن.

هێ: دژی بیرو رای گشتی ئەوروپایە کە پێویستی دەرکردنی (تورکە کێوییەکان) لەئەورووپاو رزگاری مەسیحانیان لەبەر چاوە.

ئاقچۆرا لەمەڕ ئیتحادی ئیسلامەوە لەو باوەڕەدا بوو کە لەلایەك دژی مەیلی نەتەوە پەرستییە کە رۆژ بەرۆژ لەوڵاتەکانی ئیسلامیدا، زێتر دەبێو، لەلایەکی دیکەشەوە بەرژەوەندی وڵاتە کۆلۆنیالیستەکان لەبەرچاو ناگرێ. بۆیە ناتوانێ بۆ زیندوو کردنەوەو پتەو کردنی ئیمپراتۆری عوسمانی، مەیلێکی بەبایەخ بێ.

بۆیە سێیەمین سیستەمی سیاسی دەمێنێتەوە: پان تورانیزم کە تەنیا هۆکاری بەبایەخە بۆ زیندوو کردنەوەی ئیمپراتۆری، بۆیە دەبێ ڕێگای رزگاری لەپان تورکیزم، یەکێتی نەتەوە پەراگەندەکانی تورکدا بدۆزرێیەوە.

* پان تورانیزم هیچ یەك لەو هۆکارە ناکۆکانەی تێدا نییە کە بەری پێشکەوتنی ئیتحادی عوسمانیو ئیتحادی ئیسلام دەگرن. ئایدیۆلۆژیی ناوبراو بەزۆری دژی رووسیایە، دەوڵەتی بەهێز، ئەمما قابیلی زیان. ئاقچۆرا بەسوور بوونەوە پێشبینی دەکرد کە دەوڵەتە ئەوروپییەکانی دی بەهۆی ئەو بەرژەوەندییانەی لەرۆژهەڵاتدا هەیانە نەتەنیا دژی پان تورانیزم نین، بەڵکو بەپێچەوانەوە یارمەتی سەرکەوتنیشی دەدەن.

بەسادەیی دەتوانرێ پەی بەرۆشنبینییە سیاسییەکانی ئاقچۆرا ببرێ. بەم حاڵەشەوە، لەو دەماندا بیرو رای سیاسی تورکەکانی دەرەوە بەهەمان ئەندازەی ئاستانە لەبەرامبەر ئامانجەکانی پان تورانیستەکاندا بێ بایەخ بوو. (عەلی کەمال) سەرنووسەری گۆڤاری (تورك) یەکەم کەس بوو وەرامی ئاقچۆرای دایەوە. ئەو زۆر بەگەرمی لەئامانجی ئیتحادی عوسمانی داکۆکی کردو گاڵتەی بەوەرامی (ئەحمەد فەرید بەگ)ی (خەونو خەیاڵی ئیمپریالیستەکانی تورك) کرد.

ئەندامی ئایندەی حیزبی (ئیتحادو تەرەقی)و نوێنەری (کوتاهیە) نەرمتر بوو، و لەو دەمییەوە ئۆپۆرتۆنیستی سیاسەتی ئایندەی (ئیتحادو تەرەقی) نیشان دەدا. (ئەحمەد فەرید) دانی پێدانا کە (ئیتحادی ئیسلام نەکردەیەو دوا رۆژێکی روونا کی نییە)، لەگەڵ هەندێش، (ئەمما ئێستا دەبێ سوود لەو تایبەتمەندییانەی هەیەتی وەربگرین بۆ گەیشتن بەئامانجەکانمان).

پان تورانیزم هەرچەندە ئایندەیەکی درەخشانی هەیە، بەڵام لەواقیعدا بوونی نییەو ناشتوانرێ پشت بەشتێك ببەسترێ کە بوونی نییە. سیاسەتی عوسمانی هەرچەندە دوا رۆژێکی مزگەری نییە، بەڵام ئێستا سیاسەتێکە بۆ ئەمڕۆ. بۆیە بەسوودەو تەنیا هۆیەکە بۆ پاراستنی بوونی سیاسی تورکیا.

سیاسەتی دەرەوەی حزبی ئیتحادو تەرەقی لەڕێگا باوەکان لای نەدەدا. سیاسەتی

ناوبراو تێدەکۆشا ئیمپراتۆری عوسمانی‌و هەلویستەکانی وەك دەستەلاتێکی رۆژئاوایی بپارێزی، واتە هەمان ئەو کارەی عبدالحمیدی دووەم دەیکا. عوسمانچێتی‌و ئیتحادی ئیسلام لەروانگەی حزبی ئیتحادو تەرەقی‌یەوە، هۆکاری سادە بوون بۆ پێشخستنی ئامانجەکانی.

حزبی ئیتحادو تەرەقی بەهەلگرتنی ئەم ئالا فریو دەرە کە لەواقیعدا خۆی لەژێری‌دا شارد بۆوە، لەسالی ١٩٠٨دا هاتە ئاستانە.

() ئیلچی: سەفیر، نێردراوی تایبەتی. (و.کوردی).

«(١)»: Vambery La Turguie d aujourd hui etd avavit

«٢»: فەرمانێك کە بەو پێیە سلطان عبدالحمید لەسالی ١٨٣٩دا زنجیرە ریفۆرمێکی ئیداری‌و قەزایی‌و عەسکەری راگەیاندو بریار بوو بەپێك هێنانی (ئەنجوومەنی حوکمی عەدلی)، ئەمری دابین کردنی دارایی‌و گیانی دانیشتووی ئیمپراتۆریەت جێبەجێ بکرێ.
(و.ف)

(٣): عەلی بەگی حسین زادە لەسالی ١٨٦٤ لە (سالیان)ی قەفقاز لەدایك بووە. لەپترزبۆرگ خوێندنی پزیشکی تەواو کرد. هاوکاتی ئەوە، زانیاری‌ی خۆی بەزمانی ئینگلیزی، فەرانسە، ئالمانی‌و زمانە کۆنەکان تەواو کرد. لەسالی ١٨٨٩دا لەئاستانە جێگیربوو بووە مامۆستای کۆلیجی پزیشکی سوپاو لەسالی ١٨٩٥ پزیشکی خەستەخانەی نوێی حەیدەر پاشاو لەسالی ١٩٠٠یش‌دا مامۆستای کۆلیجی ئەفسەری بوو. لەسالی ١٩٠٥ گەرایەوە قەفقازو لەگەڵ ئاقاییف رۆژنامەی (حەیات)ی دامەزراند. لەسالی ١٩١٠ گەرایەوە ئاستانەو لەرێکخراوەکانی (تورك یوردو) و (تورك ئۆجاقی)دا کاری دەکرد. لەسێیەمین کۆنگرەی حزبی (ئیتحادو تەرەقی)دا بەئەندامی (مەرکەزی گشتی) هەلبژێردرا.

# پان تۆرانیزم

# دوای دەستووریی عوسمانی

خولی ئازادی چالاکی‌یە سیاسی‌یەکان کە لەگەڵ بزافی دەستووریی عوسمانی دەستی پێ‌کرد، مەیدانێکی بەرفرەی کارکردنی بۆ سیاسەتمەدارە پان تورانیستەکان ئاوەڵا کرد. ئەوان بڕیاریاندا لەتورکیای ئازادو سەربەخۆدا خڕ ببنەوەو ئاستانە بکەنە ناوەندی پان تورانیزم. لەبەر هەندێ لەم شارەدا کۆبوونەوەو بەهۆی چاپەمەنی‌یەکانی ئاستانەوە ئامادەیی بەردەوامی خۆیان نیشانداو هەتا خزانە نێو ڕێکخراوە پان ئیسلامیستەکانیشەوە. بەم شێوەیە یەکەمین تۆڕی ڕێکخراوی پان تورانیستەکان لەتورکیا، دروست کرا.

لەگەڵ هەموو ئەمانەدا، هێشتا عوسمانیگەری مۆدیلی ڕۆژگارو سیاسەتێ ڕەسمی حزبی (ئیتحادو تەرەقی) بوو. وشەی (یەکێتی) کە دروشمو هەتا ناونیشانی حزب بوو، بەهیچ شێوەیەك واتای (یەکێتیی تورکانی دنیا)ی نەدەدا، بەڵکو بەواتای (یەکێتی هەموو نەتەوەکانی دانیشتووی تورکیا) بوو. حزبی (ئیتحادو تەرەقی) هێشتا تێ‌دەکۆشا هەموو ئەو نەتەوە جۆربەجۆرانە کە ئیمپراتۆریەتیان پێك دێنا لەکۆمەڵێکی پێشکەوتوودا بەنێوی (میللەتی عوسمانی) کۆبکاتەوە. حزب بەئومێد بوو لەئایندەدا، یەك زمانو یەك شارستانی بۆ ئەم میللەتە بخولقێنێ، واتە هەمان ئەو کارەی کە لەوڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا کرابوو، لەقۆناغی دواتردا ئاوێتەو یەکسانیان بکا.

بەڵام ئاقچۆراو هاوڕێکانی کە ئیفلاسی عوسمانیگەریو یەکێتیی ئیسلامیان پێشبینی کردبوو،و چاوەڕوانی هەلێکی گونجاو بوون بۆ دەست پێ‌کردن، پڕوپاگندەکانیان توندتر کردو هەندێ پێشکەوتنیشیان وەدەست هێنا. ئەوان پێشتر

ئەندامانی بەشی ئاستانەی (حزبی ئیتحادو تەرەقی)یان لەگەڵ بیروڕاکانیان یەك خستبوو،و ئێستا تێدەکۆشان خۆ بخزێننە نێو (ناوەندی گشتی)ی حزب کە بنکەکەی لەوان دەماندا لە (سالونیك) بوو. ئامانجی بەپلەی ئەوان تورکی کردنی ئیمپراتۆریەتی عوسمانیو لەیەکەمین قۆناغدا حزبی سیاسی- دەستەڵاتەکەی، بوو. چونکە تەنیا دەوڵەتێکی بەراستی تورك دەیتوانی نەخشەکانی پان تورکیزم قبووڵ بکاو کاری یەکگرتنی نەتەوە تورك نەژادەکان، بەئەستۆوە بگرێ.

ڕێبەرانی پان تورانیزم زەمینەیەکی تارادەیەك گونجاویان بۆ پروپاگندەکانی خۆیان لەنێو سەرکردایەتی حزبی ئیتحادو تەرەقیدا دۆزیەوە. ڕێبەرایەتی حزب دوای یەك ساڵ هەوڵی ناشیانە ئێستا بەناڕەحەتییەوە تێدەگەیشت کە سیاسەتی «نیشتمانپەروەریی عوسمانی»ی حزب پێشکەوتنێکی کەمی لەنێو ڕەگەزی غەیرە تورکی نێو ئیمپراتۆریەتدا، کردوە.

پلە بەپلە خۆشبینیو حەوسەڵەی ڕێبەرانی حزب واتە دەسەڵاتدارانی نوێ نەدەماو دوامین پاشماوەی لیبرالیزمو دادپەروەریشیان توڕدا. بۆ شیکردنەوەی ئەم خولەی دەستەلاتی ئیتحادو تەرەقی باشترە، گوریسی قسە بدەینە دەست ئەحمەد ئەمین بەگی سەرنووسەری ڕۆژنامەی (وەتەن)ی ئەنقەرە.

(مەکینەی ئەسلی سیاسەتی حزبی ئیتحادو تەرەقی دەبوایە ئیمپریالیزمی کۆرو داگیرکەر بێ... دروشمی وەك (عوسمانیگەری)و «یەکێتی هەموو نەتەوەکانی دانیشتووی تورکیا بێ ڕەگەز پەرستیو جودایی ئایینی» هێشتا دووبارە دەکرانەوە، بەلام ئیدی «یەکێتی» مانای یەکێتی ڕەگەزە جۆربەجۆرەکانی ئیمپراتۆری بەیەکسانی مافو ئەرك لەخاکێکی بێلایەندا، نەدەدا، بەلکو ئەم دروشمانە بۆ ئەوە سوودیان لێوەردەگیرا کە نەتەوەکان لەرەگەزی دەستەلاتداردا بتوێنەوەو ئەگەر پێویست بکا بە زۆر لەگەڵیدا ئاوێتە بکرێنو یەکسان بن. دروشم دان دەربارەی مافو ئەرکی هاوڵاتییەکانی وڵاتێك بەشێوەیەکی گشتی، لەبەرچاوگرتنی هەلو مەرجی دەوروبەرو ئەو تەگەرانەی لەرێگایدا هەن، هەڵبەت دەبوایە ببێتە هۆی بەکار بردنی شێوازی توندو تیژ)«١».

لەم بەرەنجامەوە تارەشەکوژی لەئاستی دەوڵەتدا تەنیا هەنگاوێك نێوانیان هەبوو، ئەندامانی حزبی ئیتحادو تەرەقی ئەوەشیان هەڵێنا. تاوان لەساڵی ١٩٠٩ لەویلایەتی (کیلیکیە)دا ڕوویدا، لەلایەن کارمەندانی دەوڵەت لەناوچەکەدا وروژاو بەهۆی سەربازانی «ڕزگاریخواز»ەوە کە لە سالونیکەوە نێردرا بوون، تەواو کرا. کەمتەرخەمییەکەشی خرایە ئەستۆی عەبدولحەمیدو (کۆنەپەرستان)و هەروەکوو گەلەك جاران ڕوو دەدا، قوربانییەکان تاوانبار کرانو بەشێك لەبەرپرسییەتیەکەیان خرایە مل.

ڕۆژێك دوای کوژرانی (٢٠) بیست هەزار ئەرمەن، یەکێك لەرێبەرانی حزبی ئیتحادو تەرەقی بەراشکاوییەوە رایگەیاند: (وڵاتی ئێمە دەبێ بێ چەندو چۆن تورك بێ، بوونی ڕەگەزی ناوچەیی غەیرە تورك هەنجەتێك دەداتە دەست ئەوروپاییەکان

بۆ خۆ تێگەیاندن. ئەوان دەبێ بەزۆر بکرێنە تورک)«٢».

لەبەر هەندێ دەبینین، لەراستیدا جوداییەکی زۆر لەنێوان عوسمانیگەریی حزبی ئیتحادو تەرەقیو تورکچێتی پەسەندی پان تورانیستەکاندا نەبوو، لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا، هێشتا حزبی ئیتحادو تەرەقی لەسالی ١٩٠٩ ئامادە نەبوو بەرەسمی پرانسیپی تورکچێتی قبووڵ بکا. لەوانەیە لە کاردانەوەی تێکۆشەرە چالاکەکانی عەرەب، ئالبانیایی، کوردو چەرکەس ترسابن. رەنگە هێشتا هەر جۆرە ئومێدێکیان بەیەکسان کردنی نەتەوەکانی نێو ئیمپراتۆریەت (بەشێوەی ئەمریکایی یان تورکی) لەدەست نەدا بێ‌و لەبەر هەندێش بەدروشمی عوسمانیگەرییەوە چەسپا بوون.

بەهەر حاڵ واقیعیەت ئەوەیە، لەکۆنگرەی سالونیك کە هاوکاتی کوشتاری (کیلیکیە) بەرێوە دەچوو، وەختێ کەمال بەگی سکرتێری بەشی ئاستانە بەناوی هاورێکانییەوە رایگەیاند: (ئامانجی حزبی ئیتحاد ترقی پێشکەوتنی میللەتی ئێمە) نوێنەران قسەکەیان بڕیو لەهەموو لایەکەوە هاواریان کرد: (ئامانجمان تەنیا جێبەجێ کردنی بەرنامەی حزبە، ئێمە ئامانجێکی دیکەمان نییە).

لەنەمان کۆنگرەدا، زیاء بەگ رێبەری سیاسیو نوێنەری دیاربەکر کە خۆ تێگەیاندنی نادۆستانەی نوێنەران لەقسەکانی کەمال بەگ کاری تێکرد بوو، بەرێبازی تورکچییەکانەوە پەیوەست بوو. ضیاء بەگ بەئەندامی کۆمیتەی ناوەندی حزب هەڵبژێردراو لەگەڵ نوێنەری ئاستانە چووە پایتەختو بەیارمەتی ستادی پان تورانیستەکانی ئەو شارە، بەرنامەیەکی هەڵپەرستانەی بۆ تورك کردنی وڵات، رێكخست. پاشان گەڕایەوە ناوەندی حزب لەسالونیك.

موحەمەد ضیاء بەگ کە بەم شێوەیە بووە بنیاتنەری ئایدیۆلۆژی پان تورانیزمی تورکیا، لەسالی ١٨٧٦ لەدیاربەکر هاتبووە دنیاوە. هەرچەندە خۆی لەکوردانی زازا بوو، بەڵام بەتەواوی ماناوە بووبوە تورك. خوێندنی سەرەتاییو ناوەندی لەخوێندنگاکانی عەسکەری (رشدیە)و (عەدادی)ی دیاربەکرو خوێندنی بەرزی لەخوێندنگای (بەیتاری)ی ئاستانە تەواو کردبوو. لەحەفدە سالییەوە بیروڕای شۆڕشگێرانەی خۆی نیشاندا، ئەویش ئەو دەمە کە لەڕێو رەسمێکی عەسکەریدا ئامادە نەبوو بڵێ ،(بژی سولتان). لەبەر هەندێ تاراددەی مردن دارکاری کرا. بۆیە هەوڵیدا خۆی بکوژێ. ئەمما لەباشی بەختەکەی، رزگاری بوو. دواتر هەڵوێستەکانی سەختتر کردو هەرکە گەیشتە ئاستانە، کتێبەکەی (لیون کاهون)ی کڕیو ئاشنایەتی لەگەڵ عەلی حسین زادەش پەیدا کرد.

لەسالونیك، کۆمەڵێك رۆشنبیر گۆڤاری (گەنج قەلەملەر)یان دامەزراند بوو کە عەلی جەناب، عومەر سەیفەددینو عومەر ناجی گوتاریان تێدا دەنووسیو خەباتێکی بەرفراوانیان لەمەر ریفۆرمی زمان دەست پێ کردبوو. ضیاء کە لەمێژبوو (بەرنامەی رزگاری نیشتمانی) واتە لەواقیعدا بەرنامەی پان تورانیستەکانی لەمێشك دابوو)

(گەنج قەلەملەر)ی وەك هۆیەكی باش بۆ بلاو كردنەوەی تیوری‌یەكانی، زانی.
بەپێشنیاری عەلی جەناب، ئەویش هاتە نێو دەستەی نووسەرانو لەگەلیاندا دەستی دایە پروپاگندە بۆ توركچێتی.
بنیاتنەری توركچێتی دەبوایە سەرەتا ناوی خۆی بگۆڕێ، بۆیە ناوی ئایینی (موحەمەد)ی تووڕ داو ناوی لەخۆی نا (ضیاء گوك ئالپ)و بەو ناوەوە نێوبانگی دەركرد. بێدرەنگ (ضیاء گوك ئالپ) ژمارەیەك رۆشنبیری ئۆپۆرتۆنیستی لەدەوری خۆی كۆ كردەوە: (موحەمەد فوئاد كوپەرلو زادە)ی مامۆستای زمانەوانیو نووسەرانی وەك ئەحمەد حیكمەت، حمدالله صبحي، جەلال شەهیر، نەسیم صارم، یەعقوب قەدریو چەند كەسێكی دیكەی بلاو كراوەكە، (سالونیك)یان كردە مەكۆی خۆیان.
وەرگێڕانی یەكێك لەشیعرە هەوەلینەكانی ضیاء گوك ئالپ كە لە (گەنج قەلەملەر)دا بلاوی كردبۆوە (بێگومان ناونیشانەكەی تورانە)، بەم شێوەیەی خوارەوەیە:

«بانگەكان
كەلەرەگەكانمدا دەزرنگێنەوە
لەقوولایی مێژووەوە دێن
نە لەنێو پەرەی كتێبەكان
لەئاوازی لێدانی دەمارەكانم
لەترپەی بەخرۆشی دلم
سەركەوتنی نەژادە ماقوولو هەلبژاردەكەم
دەخوێنمەوە

سیمای ئاتیلاو چەنگیز
ئەم شانازی‌یانەی نەژادم
لەژێر باری تۆمەتو درۆدا
قەدەغە كراون
لەبارێكدا، شانازی‌یەكانیان
ئەوەندەی تزارو ئەسكەندەر دەبن

لەترپەی لێدانی دلم دایە
چونكە دلی من ئۆغۆز خان
بەباشی دەناسێ
كە لەبارەگای مێژوودا هێشتا رازە
ئەو لەخوێنی مندا زیندووە
گەورەو رێزدار
ئۆغۆز خان.......

دلی پڕاو بڕ کردووم

نیشتمانی تورکان، تورکیا نی‌یه
تورکستانیش نی‌یه...
دوور تره.
ولاّتێکی فراوانو نەمر،
توران».

وەختی ئەم شیعره بلاّو کرایەوه، نەوەی نوێ بەپەرۆشی‌یەکی زۆرەوه پێشوازی لێکرد. چینی رۆشنبیر کە لەسالونێك چالاکی ئەنجام دەدا، دوو ئامانجی هەبوو:

١. نێوخۆ: پاکسازی تورکیا لەرەگەزی (غەریبو ناپاك)، گێڕانەوەی پاکژی نەژادی زمانی تورکیو ئەدەبو ئایین، زیندوو کردنەوەی رۆشنبیری تورکیای کۆنو دەزگاو ڕێو شوێنەکان، پەروەردەو بلاّو کردنەوەی مێژووی تورکیای بەر لەعوسمانیو بەم شێوەیە خولقاندنی وێژدانو شانازی نەژادیو میللی.

٢. دەرەوە: سەلماندنی پەیوەندی نەژادیو رۆشنبیری‌یەکانی نێوان نەتەوە تورانی‌یەکان لەرێی لێکۆلینەوەی زانستی، دروست کردنی هەستی هاوکاریو یەکێتی، خولقاندنی گیانێکی هاوبەش لەنێوانیاندا (لێرەدا دەبینین هێشتا ئامانجی سیاسی لەکایەدا نی‌یه).

ئەم بەرنامەیە لەلایەن ئەنجوومەنی (یەنی لسان) (زمانی نوێ) کە (گەنج قەلەمەلەر)ی بلاّو دەکردەوه قبوولّ کراو دوای ئەوەش ئەنجوومەنی (یەنی حەیات) (ژیانی نوێ)و وتە بێژەکەی (یەنی فەلسەفە) (فەلسەفەی نوێ)ش قبوولی کرد.

بەزوویی ئەو دوو ئەنجوومەنە یەکیان گرتو بەرەیەکی بیرو باوەڕیان دروست کرد. (تورکچی‌یەکان) لە رۆژنامەکانیاندا بێ‌پەرواو بەردەوام نە وە ی لاوی (سست و بێ‌ئایدیال)ی پایتەختیان دەدایە بەر هەلمەتو سەرباری هەندێش ئیدیعایان دەکرد کە ئەوان چینێکی (هەلبژاردە) پێك دێنن. گەورەکانی پایتەختیش گالتەیان بەم لاوە بێ‌ئەزموونو ئیدیعاکەرانە دەکرد کە دەیانویست تورکیا(رزگار) بکەن. دەبێ ئەوەشی لێ‌زیاد بکەین کە لەوان دەماندا شارێکی وەکوو ئاستانە هەتا بۆ یەکێك لەبیرەوانی دەمارگرژی ئەم (ئایدیال)ەش جێگایەکی گونجاو نەبوو. دەولەت پشتیوانی لەئامانجەکانیان نەدەکردو نوێنەرانی سیاسی ئەورووپایی چاوەدێر بوون.

(ئەنجومەنی ئەدەبی‌ی تورکیا) کە دوای شۆڕشی ١٩٠٨ بەهۆی ئاقچۆرا، نەجیب عاصم، ئەحمەد حیکمەتو چەند کەسێکی دیکە دامەزرابوو، تەمەن کورت بوو. لەلایەکی دیکەوه، لەئەنجامی خۆ تێ‌گەیاندنی راستەوخۆی بالویزخانەی ئینگلستان، دەولەت یەکەمین (تورك ئوجاق)ی کە لەسالی ١٩٠٩دا لەلایەن حمدالله صبحی‌یەوه دامەزرابوو، داخست.

بزافی (یەنی لسان) تێڕوانینی ئیجابی نووسەرانی نەوەی کۆنی وەك ئاقا گوندوز، عبدالله جەردەر، حسین جاهدی بۆ خۆی کێش کرد (دوا کەس

سەرنووسەری رۆژنامەی («تەنین»دا بوو). هەروەها خاتوو خالدە ئەدیب کە لەسالی ۱۹۱۰دا چیرۆکی ئایدیۆلۆژی خۆی بەناوی (تورانی نوێ: چارەنووسی تورکێك) لەرۆژنامەی (تەنین) بلاو کردەوە، بەپێی قسەی وەزیری رۆشنبیری تورکیای نوێ (ئەمرۆ بەکتێبی پیرۆزی پان تورانیزم دەژمێردرێ). نووسەری ناوبراو لەکتێبەکەیدا، تورانی گەورەی ئایندە کە بەهۆی خەباتی پان تورانیستەکان پێك دێ. بەشێوەی ئامانجشار نیشان دەدا. تورکچی‌یەکان لەلایەن ئەنجوومەنی ناسیۆنالیستەکانی (فدیر ئاتی) (فجر الاتي) پشتیوانی دەکران.

نووسەرانی رێبازی کۆن، وەك ئەبو ضیاء تەوفیق، ئەحمەد مەدحەت، ئەکرەم رفیع زادە، سەعید کەمال پاشا زادەو ئەوانی دیکە کە لەدەوری بلاو کراوەی (تەسویر ئەفکار) کۆبووبونەوە، بەتووندی دژی بزافی (یەنی لسان) بوون. ئەوان بەرگری‌یان لەو تیوری‌یە دەکرد کە زمانو ئەدەبی عوسمانی بەوەرگرتنی (شۆرش)ێکی وا لەزمانو رۆشنبیری‌دا، دەولەمەندو جوان نابێ. هەتا (رەزا توفیق)ی فەیلەسووف سوور بوو کە لەسەرانسەری تورکیادا یەك تورکی رەسەن نی‌یە ـجگە لەخانەدانی سولتانـو تورکچێتی بە (ئیمپرالیزمی دروستکراو) دەزانیو پروپاگندەکەی مەحکووم دەکردن. دەبێ ئەوەش بلێین کە تەنیا چەند کەسێك لەو رۆشنبیرانە، لەسەر قسەکانی خۆیان سوور بوون.

رۆشنبیرانی ئەندامی حزبی (ئەحرار)، لەوانە عەلی کەمال، جەلال نوری، فکرەت لوتفی دژی پان تورانیزم بوون، بەتایبەتی دوو شاعیرو دوو نووسەری بەناوبانگ بەتووندی دژی ئەم بیرو باوەڕە بوون: حەمید عەبدولحەق، توفیق فیکرەت، شیهابەددین جەنابو سلیمان نەزیف. کەسی دوایی کە بەرەسەن کورد بوو ماوەیەکی زۆر خەباتی لەدژی پان تورانیزم درێژە پێدا.

ئامانجی ئەو، ئاشت کردنەوەی (عوسمانیگەری، ئیسلامیگەریو تورکچێتی)بوو. ئەو لەگەڕان بەدوای رەگی عوسمانیو وەسفە باوەکەیاندا، ئامادە نەبوو لە (عوسمان)ی بنیاتنەری ئیمپراتۆری تێپەڕێنێ، لەبارێکدا تورکچی‌یەکان (ئۆغوز)یان بەقارەمانر باپیرە گەورەی نەژادەکەیان دەزانی. مشتو مڕ لەنێوان سلیمان نەزیفو ئەحمەد ئاقاییف ماوەیەکی خایاند. نەزیف بەرنامەی پان تورانیستەکانی بە (فانتزی) ناو بردو بەلام سەرەنجام ئاقاییف کە پشتیوانی‌یەکەی «ئیرادەی نەتەوەکانی تورکو تەتەر»و رێکخراوێکی تارادەیەك بەهێز بوو، توانی نەزیف بێ دەنگ بکا.

موفتی‌یە موسلمانەکان مەترسی‌یەکی گەورەتر لەرۆشنبیرانی لیبرال بوون. (ئیسلامچی‌یەکان) دژی (تورکچی‌یەکان) بوونو لەلایەن خەلکێکی فراوانەوە پشتگیری دەکران،و رێکخستنێکی پتەو ئۆرگانی چاپەمەنی‌ی بەهێزیان هەبوو. رۆژنامەی (سیرات موستەقیم) ئۆرگانی تیراژـ زۆری کۆمەلەی (مەلامح) رێکخراوی زۆر بەهێزی ئیسلامی، بەسەر سەختی دژی (تورکچی‌یەکان) خەباتی دەکرد. لەبەر هەندێ (تورکچی‌یەکان) ناچار بوون سوود لەهەلو تەگبیر وەربگرن تابتوانن مەلا لاوەکان بۆ لای خۆیان راکێشن.

خەڵكی، بێلایەن بوونو هیچیان لەمەڕ ئەو سوودو زیانانە نەدەزانی کە ئەمانو ئەوان باسیان لێوە دەکرد.

کۆمیتەی ئیتحادو تەرەقی کە لەگۆڕانکاریەکانی بەرەی مەکدۆنیا نزیکتر بوون نەك ئاستانە، بەگرو تینێکی زۆرەوە، دەسەلاتو بەهای ئەم ناسیۆنالیزمە نەژادی‌یەی دەست نیشان دەکردو باوەڕی خۆی بە (یەکسانی کردنی نەتەوەکان بەشێوازی عوسمانی) کە ڕۆژ بەرۆژ ناعەمەلی تر دەبوو، لەدەست دەدا.

جارێکی دی، یەکێك لەنووسینەکانی ئەحمەد ئەمین دەنووسینەوە کە دەڵێ: (سیاسەتێکی وا جگە لەوێرانی ئەنجامێکی دیکەی نابێ... جگە لەزیاد کردنی قۆرت لەنێوان تورکو غەیرە تورکدا کارێکی لەدەست نایە. زۆربەی تورکەکان داگیرکەر ترو شەڕفرۆشتر بوونەو هەتا بەئاشکرا، بوونی ئیمپراتۆریەتیان خستۆتە مەترسی‌یەوە.)(٣)

شۆڕشگێرانی یۆنانی، بولگارو سرب کە بۆ درێژە پێدانی ژیانی نەتەوایەتی خۆیان شەڕی چەکداری‌یان دەست پێکردبوو، ئامادە نەبوون ئەم جۆرە عوسمانیگەری‌یە قبووڵ بکەن. هەر جۆرە هەوڵێکیان بۆ خۆیانو سەربەخۆیی نێو خۆیی‌یان دابین بکەن. هەر جۆرە هەوڵێکیان بۆ (بوونی عوسمانی) ڕەتدەکردەوە. لەدوایی‌دا، یاخی بوونەکانی حەران، یەمەنو ئالبانی نیشانی دەدا کە نەتەوە موسلمانەکانی غەیرە تورك لە بەرنامەی یەکسان بوون لەگەڵ تورکەکاندا، هیچ مەیلێکیان نی‌یە.

ناوەندی چالاکی حزبی ئیتحادو تەرەقی کە لەسالونیك جێگیر بوو، بنکەی ئاستانەی خستە ژێر گوشارەوە تاباری دوو دڵی‌و نارۆشنی خۆی کۆتایی پێ‌بهێنێ، ضیاء بەگ (کە زانیمان بوو بووە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی)، داهێنەرو دروستکەری ئەم گوشارانە بوو کە هێدی هێدی ڕێبەرایەتی حزبی بەرەو تورانیزم برد.

پاشان بینیمان چۆن حکوومەتی ئیتحادو تەرەقی چاوی لە (عوسمانیگەری) پۆشی. ئەمما سیاسەتی نوێ سەرەتا بەرگی ئایینی نیشان درا. حزبی ئیتحاد لەکۆنگرەی ١٩١١ی خۆیدا ئەم بەلاغەی پەسند کرد:

«ئیمپراتۆریەت سیمای ئیسلامی بەخۆوە دەگرێ، ڕێز گرتنی دەزگاو بەها ئیسلامی‌یەکان، دابین دەکرێن. نابێ مافی هەبوونی ڕێکخستن بەو نەتەوانەی دانیشتووی ئیمپراتۆری بدرێ کە ژمارەیان کەمە. زمانی تورکی باشترین هۆیە بۆ جێگیر بوونی دەستەڵاتداریتی ئیسلامی‌و یەکسان کردنی ڕەگەزە نێو خۆیی‌یەکان».

بەلاغەکە دوو واقیعیەتی نیشان دەدا: یەکێك، لەبەرچاو گرتنی هۆکاری ئیسلام لەلایەن حزبی ئیتحادو تەرەقی کە تائێستا لەهەڵوێست دەربڕین لەدژی‌دا خۆی دەپاراست. ئەوی دیکە، بڕیاری کردنە تورکی نەتەوەکانی دانیشتووی ئیمپراتۆری بوو کە بە (ژمارەیەکی کەم) دانراون. عەرەبەکان ئەم سیاسەتەیان بە (یەکێتی ئیسلام بەبێ ئیسلام) ناو دەبرد، ئاشکرایە کە زمانی تورکی هۆی گواستنەوەی دەستەڵاتداریتی‌ی تورکە نەدەستەڵاتداریتی ئیسلامی. بەلام مەبەستی نەدانی مافی خۆ

ڕێکخستن بەنەتەوەکانی دی، هەلوەشانەوەی مافی کەمایەتی‌یەکان بوو، کە تا ئەو دەم درابوە نەتەوە مەسیحی‌یەکان، لەرووی تاکتیکی‌یەوە، ئەم بڕیارە ماوەیەکی زۆر لەلای غەیرە تورکەکاندا، شاردراوە بوو.

ڕۆشنتر لەمە، بەلاغەکە ڕووداوێکی دیکە بوو، چاوپۆشی حزبی ئیتحادو تەرەقی لەعوسمانیگەری‌و پەیوەست بوون بەپان تورانیزمی ڕەسەنی بەباشی نیشان دەدا، کونگرەی ١٩١١ سێ بنیاتنەرو ڕێبەری مێژوویی‌ی پان تورانیزمی بەئەندامێتی (بنکەی گشتی)ی خۆی هەلبژارد: ئیسماعیل گەسپەرنیسکی، عەلی حوسین زادەو یوسف ئاقچۆرا.

*

ناوەندی پان تورانیزم بێ دەنگ لەسالونیکەوە گواسترایەوە ئاستانە، لەپایتەختدا دەستەی ئاقچۆرا ـ ئاقاییف کارێکی باشیان ئەنجان دابوو:

لەسالی ١٩١٠ (ئەنجوومەنی ئاوارەکانی ئاستانە)و (ئەنجوومەنی خوێندکارانی رووسیە)و (یەکێتی خوێندکارانی قەرم)و (ئەنجوومەنی خێرخوازی بوخارا)یان دامەزراندبوو. ئەو ڕێکخراوانەش ئامانجیان ڕێکخستنی پروپاگندە لە قەرم‌و تورکستان‌و ئاسیای ناوەڕاست بوو.

ئامانجی ڕاگەیەنراوی بلاو کراوەی (تعارف ئەلموسلیمین) ناساندنی موسلمانانی تورکیاو رووسیا بەیەکدی بوو. بۆ ئەوەی باوەڕێکمان دەربارەی کارامەیی بێ‌رادەی ئاقاییف هەبێ، دەبێ وە بیرە خۆمانی بهێنینەوە کە ئەو لەسالی ١٩١٠دا ئەنجوومەنێکی دیکەی بۆ (برەو پێدانی ڕۆشنبیری‌ی ئیسلامی) لەهەشتەرخان دامەزراند. ئەنجوومەنی ناوبراو ناوی (ئیتیفاق ئەلموسلیمین)ەو ئامانجی دروست کردنی یەکبوونێکی پتەوتر لەنێو تورکان‌و ڕێبەرایەتیشی بەئەستۆی عەلی مەردان بەگی تۆپچی باشیف‌و خودی ئاقاییفەوە بوو.

هەروەها لەماوەی هەر ئەو سالە، ١٩١٠دا بوو، کە وەزیری پەروەردەو فێرکردنی عوسمانی ئاقاییفی بەناوی پشکنەری گشتی خوێندنگاکانی ئاستانە دامەزراندو بەو کارە مەیدانێکی بێ ئەندازەی وەبەر هات‌و فراوان بوونی خستە بەردەستی پان تورانیستەکان.

*

لەسالی ١٩١١دا ئاقچۆرا بلاو کراوەی نیو مانگی (تورك یوردو)و پاشان یانەیەکی بەهەمان ناو دامەزراند. ئاقچۆرا سەرنووسەرو ئەحمەد ئاقاییف‌و ئیسماعیل غەسپەرینسکی یارمەتیدەری بوون. پان تورانیستەکانی دیکەی تەتەری وەك: عەلی بەگی حسین زادە، موحەممەد ئەمین ڕەسوولزادە (تێکۆشەری سیاسی لەئێران‌و سەرۆکی دواتری «شورای میللی»ی ئازەربێجانی قەفقاز) هاوکاری‌یان دەکرد.

(تورك یوردو) توانی هەموو پان تورانیستەکانی تورك‌و هەروەها ژمارەیەك لەنووسەرانی پلەیەکی غەیرە پان تورانیست لەدەوری خۆی کۆبکاتەوە. لەژمارەی یەکەمی‌دا ناوی ئەحمەد حیکمەت، حمدالله صبحی، خالیدە ئەدیب، زەکی مەدیح، موحەممەد ئەمین، ڕەزا توفیق، جەلال نوری، ئەحمەد جەوداد، تەحسین نیهاد، تورگود

ئالپو هی دیکه هاتبوو.

دامەزراندنی تورك یوردو هاوکات بوو لەگەڵ گواستنەوەی (بنکەی گشتی) حزبی ئیتحادو تەرەقی لەسالونیکەوە بۆ ئاستانە، ضیاء گوك ئالپ ئەندامی ئەم بنکەیە لەگەڵ چەند کەسێکی دیکەی بەدەستەلاتی خۆی، چووە پایتەختو لەرۆژانی پێش لەدەست پێ کردنی شەڕی بالکان، ئاشنایەتی لەگەڵ ئاقچۆرا، کەونە خەباتکەری پان تورانیزم پەیدا کرد. ئەم دوو رێبەرە کە یەکێك تورکی تەتەرو ئەوی دی تورکی عوسمانی بوو، یەکێتی‌یەکی پتەویان دروست کردو هەوڵەکانی خۆیان لەرێی ئامانجێکی هاوبەشدا خستەگەڕ.

١- CF_ Ahmed Emine . Le Developpemende la turquie moderne a travers sa presse 1914 these de doctorat a/ lUniversite de Columbia، Newyork.

٢- CF. M. Pinon "Revue des Deux Mondes," september 1919.

٣- CF.Ahmed Emine, op cit.

# ئایدیۆلۆژیاو خواستەکانی

# پان تۆرانیزم

ئێستا کاتی ئەوە هاتووە، لەتۆمار کردنی ڕووداوو کارەساتە مێژوویی‌یەکان کەمی بسەنگرینەوەو بەکورتی هەندێ ڕەگەزی بەرنامەی پان تورانیزم لەتیوری‌و پراکتیکو هۆکارە گرنگەکەی کە تورکچێتی‌یەو ئامانجە نزیکو ستراتیژی‌یەکانی، بتۆژینەوە.

(گەنجو قەلەملەر)و (تورك یوردو) ڕەواجیان بەچی دەدا؟

پان تورانیستەکان لەقازانەوە تائاستانەو لەیەکبوونی تاسالونیك چی‌یان دەویست؟ ئەوان خوازیاری ڕزگاری نەتەوە تورانی‌یەکان بوون لەژێر دەستی بێگانەو یەکێتی‌یان لەیەکەیەکی گەورەی سیاسی‌دا کە دەبوو لەسەر بنچینەی ڕاستی‌یە مێژوویی‌و سۆسیۆلۆژی‌و دەروونناسی‌و سیاسی‌یەکان، پێك بێ.

هەروەك، زۆر جار لەمەڕ ئەم جۆرە بزووتنەوە ڕادیکالانە ڕوودەدا، پێشرەوانی ئەم بزافەش هۆیەکانی هەلمەتر بەرگری‌ی خۆیان لەڕووی ئایدیۆلۆژی، تیوری‌و کارەوە لەجیهانی ڕۆژئاوا قەرز کردووەو کردوویانەتە بەتایبەتی کاری خۆیان، تورکناسە ئەوروپایی‌و ڕووسەکانی: وەك ماکس مۆلەر، ئارمینیۆس ڤامبری، ڕادلف دوگین، فن لوکوکو ئەوانی دیکە لەمیانەی لێکۆڵینەوە نەژادناسی، زمانناسی‌و مێژوویی‌یەکانیاندا، بەلگەی یەکێتی‌ی مێژوویی‌و نەتەوەیی ـ نەژادی‌و شانازی‌یەکانی ڕابردوویان خستبووە بەردەستی ئەم ڕۆشنبیرە بەرزە فڕانە.

بەشی گەورەی ئەو نەتەوانە لەژێر دەستی ڕووسەکاندا بوون کە ئامانجیان بەزوویی یەکسان کردنی ئەوان بەخۆیان بوو. پڕوپاگندەی پان تورانیستەکان لەلایەکو سەرکەوتنی سیاسی لەلایەکی دیکەوە، تەتەرەکانیان بەرز کردەوەو یادی شکۆی ڕابردووو مەیلی ڕزگاری‌یان تێدا وروژاند بوون. ئەمەش بۆ پراکتیزە کردنی نەخشەیەکی وا، پێویستیان بەپشتیوانی برا گەورەکەیان ـ تورکیای عوسمانی ـ هەبوو.

بەم شێوەیە، ئەو تێکۆشەرو گوتار بێژانەی تەتەر دڵ پڕ لەنەفرەت لە میللەتی سەرکوتکەرو بەئایدیۆلۆژیای (ڕزگاری‌و مەزنی ئایندە) چەکدار بە (ڕاستی

سەلمێنراوی مێژوویی‌و زانستی) هاتبوونە تورکیا تابەترش‌و خوێوە دەربارەی یەکێتی‌و برایەتی هەموو نەتەوە تورانی‌یەکان پروپاگندە بکەن‌و لەوەسفی توراندا، ئەم نیشتمانە خەیالی‌یەو کەسایەتی‌یە مێژوویی‌یەکانی وەك: ئاتیلا، ئەلپ ئەرسەلان، توغرول، تەیموورو جەنگیز شیعرو گوتار بنووسن.

ئەم روانگە فریو دەرە، پێ بەپێ تورکانی عوسمانی خستە ژێر کاریگەری خۆی. رێ‌و شوێنێك کە بەهۆی ئامۆزا تەتەرەکانیان زیندوو بۆوە (هەندێ جاریش هەر هەموو دروست کراو بوو). ئەم نیعمەتە چاوەڕوان نەکراوەیان بۆ هێنا کە هەلێکیان بۆ چاك کردنەوەی ئیمپراتۆریەتە لەرزۆکەکەیان بخاتە بەردەست. توران وەك کتێبێکی پیرۆزو پێڕەوێکی نوێ جێگای قورئانی گرتبۆوە.

(راستی مێژوویی) کە پان تورانیستەکان دەیلێنەوە، لەیەك لێکدانەوەی.خێرادا، بەم شێوەیەیە:

ئەلف: نەژادناسی: هەروەك نەژادناسی رۆژئاوا سەلماندوویانە، تەتەرەکان، تورکەکان، تورکمانەکان، ئۆزبەکەکان، مەغۆلەکان، مەنچورەکان‌و ئەوانی دیکە لەیەك نەژادی هاوخوێنن‌و لەبەر هەندێ بران.

بێ: سۆسیۆلۆژی: زۆربەی ئەو نەتەوانە تایبەتمەندی ئاکاری‌و یەك رێ‌و شوێن‌و داب‌و نەرێتیان هەیە. هەموویان موسلمانن‌و بەزاراوەی جیاجیای تورکی قسان دەکەن. بۆیە هەروەك (دورگهایم)، لوبن‌و ئەوانی دیکە سەلماندوویانە، ئەو نەتەوانەی خاوەن یەك ئایین‌و یەك زمان‌و رۆشنبیرین، نەتەنیا لەروانگەی: نەژاد ناسی‌یەوە، بەلکوو لەرووی سۆسیۆلۆژیشەوە یەك میللەت پێك دێنن.

جیم: مێژوو: ئەوەی نەژاد ناس‌و سۆسیۆلۆژیستەکان دەیلێن، مێژوو تەئکیدی دەکاو پێمان دەڵێ کە نەتەوە ناوبراوەکان هۆزی جۆراوجۆری‌یەك نەژادن. ئەوان لەرابردوودا لەئۆردووی زێرین، ئیمپراتۆریەتە گەورەکانی هیونگ نون‌و جەنگیزخان‌و ئەوانی‌تر یەکیان گرتبوو لەئایندەش‌دا دەتوانن ببنەوە شتەکەی رابردوو.

دال: دەروونناسی: نەتەوە ناوبراوەکان ئەو واقیعیەتیان دەرك کردووە کە تورکن، واتە ئەندامی یەك میللەتن ئەمەش کاریگەری‌یەکی گرنگی لەنێو ئەوانی دیکەدا جێ‌هێشتووە.

هێ: سیاسی: ئەرکی تورکیای عوسمانی ئەمەیە کە وەك بەهێزترین‌و تەنیا وڵاتی سەربەخۆی تورانی ئەم (ویژدانی نەتەوەیی)یە نوێ‌و ئەم هاوکاری‌یە توندترو ئەم مەیلە بۆ سەربەخۆیی‌و یەکێتی‌ی بکاتە ویستێکی پتەو. تورکیا دەبێ هەمان ئەو نەخشە یاری بکا کە پرووس لەیەکێتی ئەڵماندا گێڕای‌و ببێتە کوورەی تواندنەوەی ئاسنی ئیمپراتۆریەتێکی بەهێز (ضیاء گوك ئالپ). پێڕەو کردنی سیاسەتی پان تورانیستی لەلایەن تورکیاوە جگە لەئەرکی برایەتی، پێویستی‌یەکی سیاسیشە.

تێز داڕێژانی پان تورانیزم لەئاقچۆراوە بگرە تاعزت علوی (لەتورك یوردو) (۱۹۱۲) بەتووندی رەسەنایەتی عوسمانی‌یان دەکوتا. دەیانگوت ئیمپراتۆریەتی عوسمانی خەریکە هەڵدەوەشێتەوەو نەفیکری هاوکاری پێچەوانەی رێڕەوی مێژوو لەنێو

رەگەزە جۆراوجۆرەکانو نەبیرورِای کەونی ئایینی، دەتوانن رزگاری بکەن. تورکیای عوسمانی کە لەشەرە یەك لەدوای یەکەکاندا ماندوو بووەو کەوتۆتە ژێر دەسەڵاتی رۆژئاوای پروپاگەندەکەر بۆ فەساد، لە بەیەك هەڵوەشاوەتەوە، تەنیا بەهێزی خۆی دەتوانێ سەربەرز بکاتەوە. دوژمنان دەیانەوێ زیاتر بێنە پێشەوەو بێ بەزەیی بن. رۆژئاوای (ئاریایی) رۆژ لەدوای رۆژ دەیەوێ عوسمانی تورانیو موسلمان لەئەوروپا دەرکا. لەبەر هەندێ جگە لەگرتنە بەری رێبازی تورکچێتی، رێگایەکی دیکەی رزگاری لەبەردەمدا نی‌یە.

تورکیا دەبێ بۆ بەهێز بوون روو بکاتە کانیاوە نەژادەکەی، واتە (٥٠) ملیۆنی تورانی کە لەئاسیای ناوەراستدا دەژین (ئەم ژمارەیە بەپێی حەزو ئارەزووی نووسەران بەرزو نزم دەبێتەوە). ئەو شتەی لەروانگەی (فون مولتکە)دا لەنیوەی سەدەی نۆزدەدا، جگە لەراسپاردەیەك شتێکی دیکە نەبوو، ئەمرۆ بۆ تورکیا رێبازێکی پێویستو پێرەوکراو بوو.

یان تورانیستەکان لەرووی پلەی حەزو ئارەزوویانەوە لەیەکدی جودا دەکرێنەوە. بۆ ئەوەی پێوەرێکی مام ناوەندیمان لەدەست دابێ، وە دوای رێبازی ئاقاییفو کازم زادە دەکەوین. لەروانگەی ئاقاییفدا، (جیهانی تورکی) لەشاخەکانی بالکان دەست پێ‌دەکاو تامەنچووری درێژ دەبێتەوەو نیمچە دوورگەی بالکان، ئاسیای گچکە، قرم، قەفقاز، داغستان، هەشتەرخان، کەنارەکانی فولگا، ساراتوف، سامارا، قازان، ئوفا، ئورنبورگ، سیبری، لێوارەکانی ئۆقیانووسی بەستەڵەکی باکوور، مەغۆلستان، تورکستانی چینو رووس، بوخارا، خیوە، خوراسان، کەنارەکانی خواروو رۆژئاوای دەریای قەزوین تائازەربێجانی ئێران، دەگرێتەوە.

کازم زادە، ئەنادۆل بەئاستانە، میزوپۆتامیا بەموسڵ، قەفقازی رۆژهەڵات لەگەڵ باکۆ، (کە لەهەمان زەماندا ئازەربایجانی ئێران بەئازەربایجانی قەفقاز ناودەبا) بۆ نەتەوەی تورکو تەتەر داوا دەکا. پاشان توران بەمانای رەهایەوە واتە ناوچەکانی نێوان قرمو وڵاتانی پشتەوەی دەریای قەزوین، ناوچەکانی ئوفاو ئورنبورگی نێوان فولگاو ئۆراڵ، وڵاتی قەرغیزستان، تورکستانی نێوان دەریاچەی ئۆراڵو بایکاڵ، زنجیرە چیایەك کە لەئالتایی تاپامیرو مەغۆلستان درێژ دەبێتەوە، کەنارەکانی ئامودریاو ئەمیرکوتسك تا ئەستەپەکانی سیبریا. بەگوتەی کازم زادە، ئەو (رێرەوانە) کە بەدرێژایی مێژوو، شەپۆلە یەك لەدوای یەکەکانی توران گرتوویانەتە بەرو لەوێدا نەتەوە تورکەکان پەراگەندە بوون، دەبێ ببنە ئەندامی (فیدراسیۆن). بەکورتی تورکەکان دەبێ هەر خالێکی رەبەر سەی وڵاغەکانیان کەوتبێ، هەرچەندە کاتیش بووبێ، بکەنە هی خۆیان. (رێرەو)ی کازم زادە، ناوچەیەك دەگرێتەوە کە خاکەکەی ئەوەندەی خاکی ئەوروپاو ئەمریکایەو (٨٠) ملیۆن کەسی تێدا دەژین.

یان تورانیستە توونرەوەکان هەتا وڵاتە موسلمانە دراوسێکانیش لەنەخشەکانیاندا دەگونجێنن. بەتایبەتی ئەگەر بەبنەچە تورانی‌یەکان حوکمی تێدا

بگیرن یان گیرا بێ، وەك ئێرانی قاجار، ئەفغانستانو هی دی. وا باشە لەحەزە تێر نەبووەکانی ئەنوەر پاشار دارو دەستەکەی نەدوێین، چونکە پان تورانیزمەکەی ئەوان، (بەتایبەتی لەسەرەتادا لەگەڵ یەکێتیی ئیسلامدا ئاوێتە بوو بوو) ئامانجی پێکهێنانی ئیمپراتۆریەتێکی عەرەب لەژێر سایەی توران بوو بەشێوەیەك کە (قورئان) لەخزمەتی توران دابێ. سنوورەکانی ئەو ئیمپراتۆریەتە دەبوو لەمەغریبەوە تاکوریا بڕوا.

لەدواییدا، تێز داڕێژەرانی (زانستی تر) خواستەکانیان بەهی ئەو کۆمەڵانە دەزانی کە لەزانستی نەژاد ناسیدا بەتورك ناودەبرانو باوەڕیان وابوو بنەماڵەی گەورەی ئۆراڵ ـ ئالتایی یان تورانی دەبنە پێنج کۆمەڵەی نەژادی:

١. کۆمەڵەی فنلاندی ئویگوری
٢. کۆمەڵەی ساموئید
٣. کۆمەڵەی تونغوز
٤. کۆمەڵەی مەغول
٥. کۆمەڵەی تورك

کۆمەڵەی تورکیش، ئەو نەژادانە دەگرێتەوە: ـ

١. تورکەکانی سیبریا (یاقوتو ئەوانی دی).
٢. تورکەکانی ئاسیای ناوەڕاست (تورکستانی چینو رووس، قۆزاق، ئۆزبەگ، قەرغیز، تورکمەنو ئەوانیتر...).
٣. تورکەکانی فۆلگا (قەپچاق، تەتەر، باشکیرو ئەوانی دی).
٤. تورکەکانی دەریای رەش (نەتەوەکانی نوغای، قەرمو قەفقاز).
٥. تورکەکانی رۆژئاوا (ئێرانیو عوسمانی).

ئەمانە، ئەو ناوچانە بوون کە پان تورانیستەکان بە (جیهانی تورك) یان (توران) یان ناو دەبردن. بۆیە وایان پێباشتر بوو کە بزووتنەوەکەیان لەباتی پان تورکیزم یان پان تورانیزم ناوبنێنو هەر کۆمەڵەیەك لەوان چ عوسمانی، تەتەر، ئۆزبەك، باشکیر یان تورکمەن، بەتورك بزانن. لە ساڵی ١٩١٠ خەلیل خاس موحەممەدوف نوێنەری ئەنجوومەنی دۆمای رووسیا لە سەکۆی ئەنجوومەنی ناوبراودا داوای کرد، ئەوان لەباتی تەتەر، بەتورك ناوببەن. زۆربەی نوێنەران ئەم داوایەیان بەغەرەزو مەیل بەپان تورانیست زانیو لەدژی راوەستان.

پان تورانیستەکان کۆمەڵێ سەرنجی فەلسەفییان خستە سەر (واقیعیەتە یارمەتیدەرەکانی ئامانجەکانیان). تەکین ئالپو (تیۆریسیونە)کانی دیکەی بزافەکە دەیانگوت: (لەچەند سەدەیەك لەمەوبەرەوە، رەسەنایەتی میللەتان بەسەر دنیای بیرو باوەڕو رووداوەکاندا حکوومەت دەکا، راست نییە کە بەبەرهەڵا کردنی عوسمانیگەریو خۆبەستنەوە بەتورکچێتی، تورکەکان ئەمافە رەواکانیان بێبەش بکەین).

پان تورانیزم فیکری «ئێردنتا»ی(١) لەئەورووپییەکان قەرز کردبوو. دەیانگوت: (بزافەکەمان ئیمپریالیستی نییە، بەڵکو ئێردنتاییە. ئەمڕۆ، هەموو میللەتانی جیهان

«ئیردنتای خۆیان هەیە. پێویستی ئازادکردنی ئەو برایانەی کە لەودیوی سنوورەکاندا لەژێر ئازارو ئەشکەنجەدان، لەئیتالیا، رۆمانیو شوێنەکانی دیکە، ئامانجێکی نەتەوایەتی‌یە. سیاسەتی (ئیردنتا) یەکێك لەگرنگترین رەگەزە پێکهێنەرەکانی سیاسەتی میللەتانە. وا نایەتە بەرچاو رێنیسانسی تورکانی عوسمانیو سیاسەتی تورکیای نوێش جگە لەمە، ئامانجێکی دیکەی هەبێ. ئامانجی تورانی یەکگرتووو سەربەخۆ یان (تورانیا ئیردنتا) لەگەڵ گیانی سەردەم کە بەتووندی ناسیۆنالیستە، تەواو جووتە. لەدوایی‌دا، نەژادی تورك تایبەتمەندی‌یەکی پێویستی بۆ پراکتیزە کردنی ئامانجێکی وا، هەیە.

پان تورانیستەکان، ئەو تایبەتمەندی‌یانە بەباش دەزانن کە میللەتانی دیکە (بەبێ لایەنی) بە کەمو کورتی تورکانی دەژمێرن: درەنگ تێگەیشتنو دلسۆزی‌یان نیشانەی ئەقلو هۆشە. کۆنە پارێزی سەختگیرانە نیشانەی ورەیە. بێ سەلیقەیی لەمامەلەدا نیشانەی دەست پاکی‌یە. ئاقاییف لە (تورك یوردو)دا دەنووسێ: (مەگەر مامەلەو بازرگانی، درۆو فەسادی ئەخلاقی لەگەڵدا نی‌یە؟) ئەو، هەروەها دەدا بیسەلمێنێ کە تورکەکان بەهۆشو سەختگیرو بەغیرەتو دلێرنو وەك نموونەش خەلکی باکووری ئێران نیشان دەدا کە بەبیرو رای ئەو تورك نەژادن.

پان تورانیستەکان بە تێشکانەوە شانازی‌یان بە (نەژادی گەورەی تورانی)یەوە دەکردو چاکەو رۆشنبیری‌یەکەیان کە زۆرتر لایەنی خەیالی بەخۆوە گرتبوو، وەسف دەکرد. بەتایبەتی تەئکیدیان لەئازایەتی، قارەمانیو سوارچاکی ئەوان دەکرد، ئەو واقیعیەتەیان دەخستە روو کە تورکان پاشای تەواوی نەتەوەکانی رۆژهەلات بوون. لەبەر هەندێ ئەوان نەژادێکی دەستەلاتدارو ئاغان.

بەپێچەوانەی بیرو باوەرە زۆر باوەکە (کە بەهۆی نەژادە وابەستەکانی‌یەوە. بلاو بۆتەوە) تورکەکان نەژادێکی بەهۆشو رۆشنبیرنو ژمارەیەکی زۆر بلیمەتیان پێشکەشی مرۆڤایەتی کردووە. ژمارەیەکی زۆر لەزاناکانی ئیسلام، تورك بوون، بەلام چونکە بەعەرەبی‌یان نووسیووە لەدنیادا بەعەرەب ناسراون. تورکەکان بەدەستکەوتو توانایان لەوەرگرتنی شارستانیەت نەك هەر لەباشترین نەتەوەکانی دنیا کەمتر نین، بەلکوو بەپێچەوانەوە لەسەرووی میللەتانی دیکەشەوەن.

پان تورانیستەکان بەئاوێتە کردنی بیرووراکانی سپنسەرو مۆنتسیکو فەلسەفەیەکی نوێیان داهێنا. دەیانگوت هەر میللەتێك خوولی زایینو پێگەیینو نەمانی هەیە. نەژادە مێژوویی‌یەکانی ئاسیای خواروو، ئەفریقیای سەروو وەك ئێرانیو میسری‌یەکان خوولی مەزنایەتی خۆیان بەسەر بردووەو بەناچاری تووشی هەلوەشانەوە بوون. ئەورووپایی‌یەکانیش لوتکەی کامل بوونو شانازی‌ی خۆیان بەسەر بردووە. مەبدوو بێچارەنو ئێستا بەرەو قۆناغی هەلوەشانەوە دەچن. هەتا ئینگلستان لەدوایین دەیەکانی خۆیدا وەك هێزێکی گەورەی جیهانی بەسەر دەبا.

بەلام زەنگی بێداری بۆ نەتەوەکانی ئاسیای ناوەراست لێدراوە، ئەوە تورانی‌یەکانن کە بەپیاوەتیو چاکە چەکدارن. ورەیەکی بەهێزو دوور لەدەستەلاتی

شارستانیەتی رۆژئاوا، هێزی بزوێنەری جیهانی ئاینده پێك دێنن. ئەو کۆمەڵە مرۆییانەی کە سەرچاوەی ژیانیان تەواو بووە، ئیدی لەبارودۆخێك دانین بتوانن هێزە روو لەگەشەو کامل بوونەکانیان بخەنە ژێر رکێفی خۆیان. تورکەکان ماخۆی خەسڵەتی بێوێنەن: وزەی گیانیو جەستەیی لەبن نەهاتوو. لەبەر هەندێ سەرکەوتن هی ئەوانە. خواستی خودا نوێ کردنەوەی هێزی دنیای لێك هەڵوەشایەوەیە لەرێگای بەخشینی خوێنی پاكو گەنجی تورانی.

دەبینین، ئایدیۆلۆژیای تورانی لەخستنەی ئەستۆی رۆلێکی مەسیح ئاسا ناپرینگێتەوە: ئیدیعایەك بەکەونی ئایینی یەهودیەو بەبێ باکی پان جەرمانیزمو پان سلافیزم.

پان تورانیزم، بەتایبەتی رێبەرانی تەتەری خستە ژێر کاریگەری خۆیەوە کە ئامادەی رزگار کردنی خۆیان لەژێر دەستەلاتی رووسەکان بوون. هەڵبەتە رێبەرانی تورکەکانیش ئەنگیزەو مەیلی خۆیان هەبوو. پان تورانیزم لەروانگەی ئەواندا هاوتای جێگیرکردنی بنەمای تورکیاو فراوان بوونی بوو. ئەوان بەپێچەوانەی رێبەرانی تەتەر کە زۆرتر سیاسەتمەداری رۆشنبیر بوون، لێپرسراوی وا بوون، گیانی سیاسی پراکتیکیان هەبوو، هەلو مەرجی جوگرافیاییو سیاسیو رۆشنبیریی وڵاتەکەیان لەبەرچاو دەگرت.

پان تورانیزمی تورك کە بەزۆری بەهۆی (ضیاء گوك ئالپ)ی تیوریسیۆنی (هەستی نەتەوایەتی)و (ئامانجی نەتەوایەتی)یەوە دارێژرا، ئەم مەسەلەیەی روون کردبۆوە.

لەساڵی ١٩٢٣دا، دەزگای کۆمەڵناسی ئەنقەرە بەرگی یەکەمی (تورك چولوق ئەساسلەر) «بنەمای تورکیەت»ی بلاو کردەوە. هەرچەندە (ضیاء) چەند بەڵگەیەکی بەدەستەوە بوو کە تورکچێتی بەشێوەیەکی نهێنی بخاتە روو، بەلام لەگەڵ هەندێش دەتەوێ تیروانینەکانی لەجیددی ترینو رێك ترین بلاو کراوەی تورکیای نوێدا بدۆزرێتەوەو دوا قسەی بزانرێ. (ضیاء) دوای یەك ساڵ، واتە لەساڵی ١٩٢٤ کۆچی دوایی کرد بەلام نووسەرانی وەك (تەکین ئالپ)ی نووسەری (تورکچێتیو پان تورانیزم) ١٩١٥و (دەوڵەتی جیهانیی تورانی)ی عومەر سیفالدین ١٩٣٠، کارەکەیان درێژە پێدا.

کتێبەکەی گوك ئالپ لەدوو بەش پێك هاتووە: بەشێکی تیوری لەژێر ناوی (گەوهەری تورکچێتی)و بەشێکی دی پراکتیکی بەناوی (بەرنامەی تورکچێتی). بەشی یەکەم دە بەشە: ١. مێژووی تورکچێتی، ٢. تورکچێتی چییە؟، ٣. تورکچێتیو پان تورانیزم، ٤. رۆشنبیریو شارستانی، ٥. گەرانەوە بەرەو خەڵك، ٦. بەرەو رۆژئاوا، ٧. ماتەریالیزمی مێژووییو ئامانجخوازی کۆمەڵایەتی، ٨. پتەوکردنی رێژدانی میللەت، ٩. پتەوکردنی هاوکاریی نەتەوایەتی، ١٠. رۆشنبیریو پەروەردەی میللی.

بەشە پراکتیکی‌یەکەشی لەمەسەلە جۆراجۆرەکانی تورکچێتی دەکۆڵێتەوە، زمان، هونەر، ئاکار، ماف، ئابووری، فەلسەفەو لەدوایشدا سیاسی. ئەم لێستەیە بەشی ئەوە دەکا کە بیرو رایەکیان لەمەڕ بایەخ و فراوانیی بزافی تورکچێتی کە لەساڵی ١٩٠٩ لەسالونیك وەردەرکەوت، لەکن پەیدا بێ. لاپەڕە کەمەکانی ئەم کتێبە وامان لێ‌دەکا، بەخێرایی بەسەر تێزە جۆراوجۆرەکانی تورکچێتی‌دا، باز دەین.

ضیاء گوك ئالپ سەرەتا بیری نەتەوایەتی شی دەکاتەوە، دەپرسێ (نەتەوە پەرستی چی‌یە؟ نەتەوە پەرستی بنەمای نەژاد نی‌یە. شێوەی کەللەسەر، رەنگی موو، چاو نەخشێکی پلە دوو لەدیاری کردنی نەتەوە دەبینن. کەواتە نەتەوە یان نەژادی پاك بوونی نی‌یە. هاوخوێنی، هۆکارێکە دەکرێ چاوی لێ‌بپۆشرێ: سەرەتا دین و مەزهەب و پاشان رۆشنبیری و شارستانی، هۆکارەکانی هاوکاری لەنێو ئەندامانی یەك نەتەوەدا وەدی دێنن. ئایین و رۆشنبیریش هۆکارێکن دروست دەکرێن و پەیوەندی‌یان بەخوێنەوە نی‌یە.

هەروەها هەڵەیە ئەگەر بڵێین ئەو کۆمەڵە کەسانەی لەنێو وڵاتێکدا دەژین، یەك میللەت پێك دێنن. لەروانگەی لایەنگرانی عوسمانی‌دا (میللەتی عوسمانی) هەموو ئەو میللەتانە دەگرێتەوە کە لەناو ئیمپراتۆریەتەکە دان، واتە ئەم هەموو میللەتانە بەرۆشنبیری‌یە جۆراوجۆرەکانیانەوە، ئەم کارە لەگەڵ ئەو قسەیەدا هاوسەنگە کە بڵێین میللەتی عوسمانی نی‌یە.

لەروانگەی لایەنگرانی یەکێتیی ئیسلامدا، میللەت هەموو موسڵمانان دەگرێتەوە، لەکاتێکدا کۆمەڵی ئایینی میللەتە نەك نەتەوە، شتێك نی‌یە پێی بگوترێ نەتەوەی موسڵمان.

شەخس پەرستان ئیدیعا دەکەن کە نەتەوە پەرستی بریتی‌یە لەبەشداری کەسانێك لەکاروباری کۆمەڵدا بەئازادی هەڵبژێردرا بن. لەم بارەدا، ئازادی‌یەك کە ببێتە هۆکاری هەڵبژاردنێکی وا، بەراستی لەهیچ شوێنێکدا نی‌یە.

ئەدی نەتەوە پەرستی چی‌یە؟

زانستی سۆسیۆلۆژی دەیسەلمێنێ: نەتەوە پەرستی زنجیرەیەك فێرکردن و رۆشنبیری هاوبەشە کە ئەندامانی کۆمەڵ بەیەکەوە دەبەستێتەوە. بۆیە لایەنی عاتیفی هەیە. (لەبەر هەندێ نەتەوە کۆمەڵەیەکی دیاری کراوی نەژادی، نەتەوەیی، جوگرافیایی، سیاسی‌یان «ئیرادی» نی‌یە. نەتەوە کۆمەڵە کەسانێکە، لەلایەك زمان و ئایینی هاوبەش و لەلایەکی دیکەش پێڕەوی رێ و شوێنی ئاکارو جوانناسی تایبەت بەخۆیانن.).

ضیاء گوك ئالپ دوای ئەوەی بەم شێوەیە باس لەنەتەوە پەرستی دەکا، هەوڵ دەدا (میللەتی تورك) پێناسە بکاو پەیوەندی‌یەکانی نێوان تورکچێتی و پان تورانیزم دەست نیشان بکا. بەباوەڕی ئەو (ئۆغوزەکان) واتە تورك و تورکمەن، یەك رۆشنبیری هاوبەش (رۆشنبیری تۆرکی) یان هەیە، بۆیە تورکن. تورك و خۆرەکان لەئازەربایجان و

خوراسان‌و ناوچەکانی دیکەی ئێران وەك تورکانی عوسمانی پاشماوەی ئۆغۆزخانن. لەرابردوویەکی زۆر دووردا، ئەم کۆمەلانە، واتە نەوەکانی ئۆغۆزخان بەهاوکاری کردنی یەکدی دەژیان.

(ئەسروش لانە هایبەشەکانی ئەدەبیات، زمان، رۆشنبیری‌و خووڕەوشت لەنێوانیاندا هەیە. شیعرەکانی دەدە قورقود، شاە ئیسماعیل، عاشیق کەرەم، کۆر ئوغلو‌و ئەوانی دیکە لەهەموو دنیای ئۆغوزیدا دەناسرێن‌و دەگوترێنەوە. فزوولی شاعیری تورك، شاعیری تورانی‌یەکانە. بۆیە سنووری نەتەوەو ناسیۆنالیزمی تورك پەڕیوەتەوە ئەودیو سنوورە جوگرافیایی‌یەکانی تورك).

لەسەر سیفەتی (تورانی) کە وەك سەرچاوەیەکی زمانەوانی بەکار دەبرێ‌و کۆمەلەی بنەمالەی ئۆرال‌ـئالتایی قسەی پێدەکەن، (ضیاء)ش وەك گەلێك لەپان تورانیستەکان ئەوەی دیاری کردنی ئەم کۆمەلە لکانەی تورك، بەکار دەهێنێ.

بەلام (توران) بەپێچەوانەی ئەوەی هەندێ کەس خەیال دەکەن، یەك کۆمەلە نەژاد نی‌یە کە جگە لەتورکان. مەغۆل‌و تونگوزو فنلاندی‌و مەجارەکان بگرێتەوە. ناوە زانستی‌یەکەی ئەم کۆمەلەیە (ئۆرال‌ـئالتایی)یە لەراقیعدا. دەستەواژەی (تورانی) ئاقارێکی بەرتەسکتری هەیە: یاقوتەکان، قەرغیزەکان، ئۆزبەکەکان، قەبچاقەکان، تەتارەکان‌و ئۆغوزەکان وەك کۆمەلە زمانی‌ـنەژادی پێك دێنن، توران ناوی ژەنەریکی ئەم نەژادە تورکانەیە. ولاتی توران بەو سەرزەمینانە دەگوترێ کە ئەم لکە جۆراوجۆرانەی تورك لەسەریدا دەژین.

ضیاء گوك ئالپ بۆ سیاسەتی تورك، ئامانجێك لەسێ قوناغدا دەستنیشان دەکا: ئامانجی نزیك: تورکچێتی. ئامانجی مام ناوەندی: ئۆغوزچێتی. دوائامانج: پان تورانیزم. ئەوەش دەزانێ کە فیدراسیۆنی ئیمپراتۆریەتی توران (سێویکی سوور)(٣)ی درەوشاوەیە کە تەنیا لەدنیای خەوندا هەیە، بەلام ئیدیعا دەکا: (واقیعیەتەکانی ئەمڕۆ دەرئەنجامی خەونەکانی دوێنێیە)و (ئامانجەکان هەمیشە ئەنگیزەیەکی بەهێزن، هەر بۆیە لەقۆناغی خەونیشدا بمێنێتەوە). ئەو قبوولّ دەکا کە ناکرێ لەکۆمەلە میللەتانی تورکی گەورەو بچووك کە لەرووسیادا دەژین. میللەتێك (بەواتایەکی پان تورانیستی) دروست بکرێ با زانستیش، ئەوانی بەتورك ناسیبێ. هەروەها قبوولّ دەکا کە تەتەرەکانی باکوور هەولّ دەدەن زمان‌و رۆشنبیری تایبەتی لەخۆیان وەدی بهێنن کە دەرئەنجامەکەی درەنگ یان زوو پێکهاتنی میللەتی تەتەری جودا لەمیللەتی تورك دەبێ. باشکیرو قەرغیزو ئۆزبەکیش هەنگاویان لەو رێگایەدا هەلێناوە. باشتریشە قسە لەبیاڤو‌و تورکە ئالتایی‌یەکان نەکەین.

چ بایەخێکی هەیە؟ لێگەڕێ رۆشنبیری تایبەت بەخۆیان بخولقێنن‌و بەناوی تایبەت بەخۆیان بناسرێن. تەواوی ئەم میللەتە نوێیانەی تورك، پەیوەندی بەیەکدی‌یەوە دەکەن تا رۆژێ فیدراسیۆنی گەورەی تورانی پێك بهێنن. ئەو کاتە تورك‌و تورکمەنەکان کە کورەکانی ئوغوزن وەك یەك میللەت دەژین‌و بەناوی تورك ناودەبرێن. ئۆغوزستان هەمان تورانی گەورەیە.

بەم شێوەیە تورکەکان لەپان تورانیزم:ا، ئەم ئامانجە د.ووره، سەرچاوەی بزراندنی خەڵکو هۆیەکی دیبلۆماسی بۆ دەوڵەت دەبینن. بەباوەڕی تیوریسیۆنەکانی ت. ئاسانترین کار لەهەوڵین دەمدا یەکخستنی تورکو تورکمانەکانە بەچەند بەڵگەیەکی رۆشنبیریو جوگرافیایی. گوک ئالپ دەڵێ: (یەکەمین کاری ئێمە وەدی هێنانی «ئۆغوزستان»ە لەرێگای تورکیا، ئازەربێجان «باکووری ئێرانو کەنارەکانی خوارووی دەریای قەزوین» تا وڵاتی خورەکان).

دوای ئەوەی ئەو دوو قۆناغەمان باس کرد، باشترە بگەڕێینەوە قۆناغی سەرەتای تورکچێتی. بۆ ئەمە دەبێ لەتورکچێتی (ئەکادیمی)، ئەم کەوڵە بەرانەی گور ی تورانیزم بەسەرەخۆیدا هەڵکێشاوەو ئەو مەسەلە رۆشنبیرییانەی کە تیوریسیۆنەکە : خستوویەتی‌یە روو، چاو بپۆشین (لەبەشی داهاتوودا لەمە دەدوێین).

ئەو دەمە ضیاء بەگ لەساڵی ۱۹۲۳دا پێویستی بەگفتو گۆ کردن دەربارەی ئەم جۆرە تورکچێتی‌یە نەبوو، چونکە ئەم کارە پێش دە ساڵ بەهۆی خەڵکانی وەکو ئەوەوە، ئەنجام درابوو. تورکەکان، بەدەست دانە کارێك کە ناودارترین باپیرانی خۆیان سەربەرز کرد، نەخشەی خۆیان جێبەجێ کرد: لەناو بردنی تەواوی نەتەوەیەكو (مەسەلەکە)یان لەروانگەی ژیۆپۆلیتیکی. مەبەستمان رەشەکوژی ئەرمەنەکانی رۆژئاوایە لەساڵی ۱۹۱۵، کە دواتر کۆمەڵکوژی یۆنانییو یونتوسو ئەیزوری سریانییو نەتەوەی دیکەشی بەدوادا هات.

(تورکیا هی تورکانە) دروشمی تورکەکان بوو.

تەنیا تورکیایەکی بەهێز دەتوانێ بۆ ئاوەدانی هاوڵاتی‌یەکانی تیبکۆشێ. ئەوان لەرێکخراوێکی بەهێزدا یەك بخا. ئیمپراتۆریەتی عوسمانی بۆگەن بووەو خەریکە هەڵدەوەشێتەوە. هێزێکی وا، دەکرێ لەکوێ پەیدا بکەین؟ لەنێو میللەتی واقیعی تورك کە ئێستا لەبوونی جووتیار ، لەناو وڵاتدا بەر جەستە بووە. لەزەخیرە جەستەیی‌یەکەی، لەماندوو نەبوونی، لەوریایی، ئەو ئاکاری، لەزمانی کە قسەی پێدەکا، لەوەفاداری، هەست بەرێكو پێکی، کیانی بێرادەی نیشتمانپەروەری جەنگاوەری‌یەکەیدا.

بەڵام بەداخەوە تورکی ئەنادۆڵ، ئەو هەموو جێگای متمانەیە، پایەگای ئیمپراتۆریەتی عوسمانی نی‌یە، لاوازی تورکیا هۆیەکەی لەپێکهاتە ناوخۆیی‌یەکانیەوە کە بەتەواوی تورك نی‌یە، سەرچاوە دەگرێ، دەستووری دەدحەت پاشا کە بەهۆی حزبی (ئیتحادو تەرەقی) جێبەجێ کرا، هەمان هەڵەی هەمیشەییو فاتیحانی عوسمانی دووبارە دەکاتەوە کە خەڵکی ناوچە جۆربەجۆرەکان بەتەواوی لەنێو ناباو یان بەزۆر لەگەڵ خۆیانیان یەکسان ناکەنو (رەعیەت)ەکانیان (کە بەدرێژایی سەدەکان ملکەچ بوون)، گەیاندۆتە ئاستی داوڵاتیان بەمافی یەکسان.

جێگای گاڵتەو دەتا پڕ مەترسیە، ئەگەر ئەو نەتەوە مەسیحیو موسڵمانانی خاوەن رۆشنبیریو میراتی مێژوویی‌و ئامانجی لێ بوودا، لەنیشتمانپەروەری تورکی

بگەڕێین. ئەوان ئامادە نین خزمەتی ئامانجەکانی (میللەت)ی تورك بکەن. ئەدی چ بکەین؟ ئایا تورکەکان دەبێ بەدوایاندا بڕۆن؟ ئەم کارە وەك کۆتایی کاری تورکانە. کەواتە پێش هەر کارێکی دی، دەبێ تورکیا سەرتاپا ببێتە تورك.

چینی ڕۆشنبیری تورکیا دەبێ روو بکاتە تورکچێتی ئاسایی‌و خۆڕسکی خەلکو پێکەوەیان بلکێنێ. بەو هۆیەوە دەبێ یەك ڕۆشنبیریی نەتەوایەتی دروست بکرێ. دەولەت دەبێ وەلآت بکاتە تورك. دەبێ بەتەواوی چاو بەسیاسەتەکەیدا بگێڕێتەوە. عوسمانچێتی وەلابنێ‌و ئیسلام لەگەل تورکچێتیدا تێکەل نەکا. دەبێ تەنیا متمانە بەتورك بکا. ڕەگەزەکانی دی نابێ وەك ئۆتۆنۆمی یان شتی تایبەتیان هەبێ. ئەوان هەقێکی وایان نییە. یان دەبێ ببنە تورك یان لەنێو بچن. میللەتی عوسمانی، بوونی نییە. لەمە بەدوا لەتورکیادا تەنیا یەك میللەت دەبێ، ئەویش میللەتی تورکە. ئەمەیە واتای تورکچێتی.

١. زاراوەیەك لەبزووتنەوەی (ئیتالیا ئیردنتا) «ئیتالیای نەگێڕدراوە»وە وەرگیرا بوو کە دوای سالی ١٨٧٠ بۆ داوا کردنی ئەو زەوییانەی هێشتا «لەژێر دەستی نەمسادا بوون»و بەخاکی ئیتالیاوە نەلکا بۆوە، هاتە کایەوە.

٢. خۆر هۆزێکی گچکەی مەغۆلە لەناوچەی (تسینگهای) چین. زۆرتر بەناوی (مونگرئر) بەناوبانگن، وا دێتە بەرچاو کە یان تورکەکان لەدەربڕین‌و لێکدانەوە تایبەتییەکانیاندا لەمەڕ خوراسان، ناوی ئەو هۆزە لەبەرچاو دەگرن.

٣. قزل ئالما: سێوی سۆر، ناوی چیرۆکێکی ضیاء گوك ئالپە، ضیاء بۆ برەو پێدانی بیرو ڕاکانی پەنای بۆ شیعرو چیرۆك دەبرد.

# بەرەو پراکتیزەکردنی بەرنامە
# (ریفۆرمی زمانو تازەگەری ئەدەبی)

لە تورکیای عوسمانیدا دوو زمان برەویان هەبوو، یەکێکیان (زمانی عوسمانی) کە تایبەت بوو بەشارنشینو خوێندەوارەکانی، وەك ئەنجومەنە بالاکانی چینی دەستەلاتدارو رۆشنبیرانو ئەوی دیکە زمانی گشتیو رەشۆکی کە بە بێزەوە پێیان دەگوت: (تورکی).

پێش (تەنزیمات)، ئەدەبی عوسمانی وەك زۆربەی لایەنی ژیانی عوسمانییەکان بەتەواوی کەوتبووە ژێر کاریگەری ئاکاری عەرەبیو جوانناسی ئێرانی، ئەدەبی بە «دیوان» (چامەو غەزەل) ناسراو، بەتەواوی تایبەت بە خودا، پێغەمبەر، خەلیفە، وەزیرو ستایشی بوونەوەر بوو. (فزوولی)ی شاعیری بەناوبانگ دیارترین نوێنەری ئەم (سەردەمی رۆژهەلاتی)یە بوو.

سەردەمی (تەنزیمات)ی رۆژئاوایی کەوتبووە ژێر دەستەلاتی ئەورووپا بەتایبەتی فەرانسەو هەرچەندە لەسەرەتادا لایەنی ئیجابی هەبوو، بەلام لە رۆژانی ستەمی سولتان عەبدولحەمیددا بەرەو دارمان چوو. زمانی ئەدەبی عوسمانی کە بەشێکی لەژێر باری وشەی عەرەبیو فارسیو ئاوازە داخراوەکەی خۆیدا سووك بووبوو، ئێستا پڕاوپڕی وشەو زاراوەی فەرانسەیی بوو. لەدژی ئەو بارودۆخە، بزاڤی (یەنی لسان) لە سالۆنیك راپەڕیو (تورك یوردو)ش لەئاستانە قۆستیەوەو پەرەی پێدا.

لەلای تورکچییەکاندا، زمانی عوسمانی زمانی شارستانیەتی تورکانو زمانی رەشۆکی زمانی رۆشنبیرییان بوو. ضیاء گوك ئالپ دەلێ: «رۆشنبیری لایەنی نەتەوایەتی هەیەو شارستانی لایەنی جیهانی.. چینی دەستەلاتدار کوسمۆپۆلیزمی بەرگەنەگری خۆی بەسەر خەلکی تورکیادا دەدا، لەبەر هەندێ دەبێ رۆشنبیریی تورکیا لە چنگی شارستانیەتی کۆسمۆپۆلیستەکان رزگاربکرێ».

وەك پێشتر هێنامان بۆ کرد، تورکچییەکان لەم بارەیەوە داهێنەر نەبوون، هەروەها باسمان کرد کە لە سالانی دەیەی ۱۸٦۰ەوە هەول دان بۆ پاکسازی زمانی عوسمانی لە وشەی عەرەبیو فارسی لەلایەکو نووسینو خوێندنەوە بە زمانی تورکی رەسەن لە لایەکی دیکەوە دەستی پێکردبوو. ئیبراهیم شناسی یەکەمین کۆششی لەم رێگایەدا کردبوو. دوای ئەو، دەستەی «ئیقدام»یش کە زۆرتر بەناوی (تصفیەچی) دەناسران، هەولیان دابوو، دەبێ ئەوەش بگوترێ؛ ئەم دەستەیە نوێیە رادیکالیو توندڕەوییەکی سیاسی تایبەتیان نیشان دابوو.

میللەتێك دەبێ ناسنامەی خۆی بیناکا. بەرجەستەترین سیمای ئەم ڕێو شوێنە جەنگیزخان، خواوەندی دەستەلاتو ئیمپراتۆری بێبەزەیی بوو، خودی ڕێو شوێنیش بریتی بوو لە هێزی سەرمەست لەکوشتارو وێرانی.

دوابەدوای شیعری (توران) کە ضیاء گوك ئالپ نووسیبووی، ئێستا نۆرەی ئەحمەد حیکمەت بوو کە لە بڵاوکراوەی «گەنج قەلەمەلەر» تیزی مێژوویی «ئۆردووی زێرین» بخاتەروو. ئۆردووی ناوبراو بەری یەکێتی پێنج هۆزبوو کە لەژێر فەرمانی (باتوخان)ی نەوەی جەنگیز، شەپۆلی هێرشەکانی خۆی تا سیلزیو پۆلەندا بردو سەرەنجام لەخاکی رووسیادا ئیمپراتۆری ڕۆژئاوایی قەبچاقەکانی دامەزراند.

ضیاء گوك ئالپ بەبێ هیچ بەلگەیەك ئیدیعا دەکا کە هۆزە ناوبراوەکان جگە لە سەلجوورقی، ئۆزبەگ، قەبچاقو یاقوت کەسیتر نەبوون، چاخی زێرینی ئەم یەکێتی‌یە لە شیعرەکانی خۆیدا (بۆ نموونە «تورك چولوق») ستایش دەکا. وەرگێڕانی بەشێکی، بەم شێوەیەیە:

ئەوان دەنگیان دەگەیننە گوێی ڕۆژئاوا
چونکە بە زمانی دڵ دەدوێن،
دەیانلەرزێنن
بەم حالەوە ڕۆلەکانی ئۆغۆزخان
قەت وڵاتەکەیان (توران) فەرامۆش ناکەن
ئەی ئەوکەسەی کە دوژمنی تورکانی،
لە کتێبەکانی بنۆڕە
تەماشاکە فارابی‌یەکانو ئەلغ‌بەگەکان کێن؟«١»
ئیبن سینای گەورەو ئاتیلای قارەمان
کوڕی چ کەسانێکن؟
تورکەکانی ئەمڕۆ تەنیا نەژادێکن،
ئەمما سبەینێ دەبنە یەك میللەت
وای لەو کەسانەی دۆستایەتی‌یان نەکەن
تورك نازانێ بلەرزێ
هەرگیز پاشەکشێ ناکا
لەرابردو، تەنیا یادگاری چاخی زێرین
لەدڵە شەریفەکەیدا دەپارێزێ»

تا ئەودەم، تورکەکان تەنیا ڕووداوو کەسایەتی‌یە مێژوویی‌یەکانی جیهانی ئیسلامیان دەناسین، ڕێوشوێنی ئیسلامی، شوێنە پیرۆزەکان و کتێبی ئیسلامی‌یان بە گەورە دەزانی. قورئانیان دەخوێندو کاتی نوێژ ڕووەو قیبلە واتە شاری پیرۆزی مەکە، رادەوەستان.

ڕۆشنبیری تورك خەریك بوو ئەوان بۆ یەکەمین جار بەرەو ڕۆژهەڵات ببا، بەرەو ئالتایی کە لەوێ هاتبوو، بەرەو رابردوو، زەمانی خاك گرتنی تورانیان. لە تۆزوخۆڵی رابردووی فەرامۆش کراودا قارەمانی تورکی دەردێنان: ئاتیلا، جەنگیزخان، ئالپ ئەرسەلان، تەیمووری لەنگ، هۆلاکۆ، ئۆغۆز. فەتحو دنیا گرتنەکانی ستایش دەکردن.

بەنیشاندانی نموونەی «شارستانیەتی پڕ لەشانازی رابردووی تورك» خەڵكی دەورووژاندو هەرچی‌یەكی نەتەوەكانی ئاسیای ناوەڕاست كە بۆ ئەورووپا چووبوون ـ بولغار، مەجار، فنلاندی‌و ئەوانی دیكە ـ لەدوای خۆیانەوە بەجێ‌یان هێشتبوو، بەمیراتی نەتەوەیی خۆی دادەنان، ئاكارو رێ‌و شوێنی كۆن، گەمە میللی‌یەكانی وەك ئەسپ سواری، قەرەگەمز، كۆرئوغلوی دەژیاندەوە. «چوسن» شیوی بار، «قەمبیز»ی خواردنەوەی میللی دەخستە نێو لیستی خواردەمەنی‌یەكانی توركەوە.«٢»

توركچی‌یەكان هەوڵێكی زۆریاندا بۆ راستكردنەوەو چاككردنەوەی بیروڕای «گومڕاكەر» دەربارەی توركان. تێ دەكۆشان سیمایەكی نوێ‌و میللی‌و نیشتمانپەروەری نەژادی، لەتوركاندا بخولقێنن. سیفەتی دڕندەیی، كە میللەتە تێشكاوەكان بەرك‌و كینەوە بە باوەر باپیرانی ئەوانیان دەدا، قبووڵ نەدەكرد. بەتایبەتی (فیردەوسی) شاعیری میللی ئێران‌و وەسفكەری شەڕەكانی ئێران‌و توران لە شانامەدا، دەبوغزێنرا. هەتا كار گەیشتە ئەوێ كە نامق كەمال (شاعیری میللی) تورك كە تا ئەودەم ستایشیان دەكرد، بەهۆی هەڵوێستی پشتگیری لەشای ئێران لەبەرامبەر (ئەمیر تەیموور)ی دوژمنی. لەچوارمێخە بدەن. نیشتمانپەروەری جۆری عوسمانی نموونەی نامق كەمال توركچی‌یەكانی رازی نەدەكرد.

******

پان تورانیزم‌ویەكێتی ئیسلام بەهیچ شێوەیەك لەگەل یەكدی‌دا كۆك نین، راستە نەتەوە تۆرانی‌یەكان زۆر زوو دینی ئیسلامیان قبووڵ كردو پان تۆرانیزم‌و ئیسلام بەیەكترەوە ئاوێتە بوون. بەڵام دووبارە لە گەوهەری بوونی خۆیاندا دژی یەكترن‌و هەمیشە ململانێ‌یەكی نهێنی لە نێوانیاندا هەبووە.

لە ئایینی ئیسلامدا، برایەتی هەموو موسلمانان بەبێ جودایی،ئامانجی سیاسی «ئومەت»ە، واتە حكومەتی ئایینی دیموكراتیك‌و جیهانی. توركچی‌یەكان لەسەرەتای هەوڵەكانیاندا رووبەرووی تەگەرەی گەورە بوون كە بەهۆی ئەم جۆرە تێفكرینە بوو، تێ‌كۆشان بەپارێزەوە ئەمما بە لێبڕاوی لابەلای بكەنەوە.

تاكە كەسی تۆرانی لەروانگەی ئاكارەوە هەرگیز ئایینپەروەر نەبووە، ئەو پەندە عەرەبی‌یەی دەڵێ: «توركمەنی زەعیفولئیمان» لەمەڕ هەموو توركەكان، راستە. سەلجووقی‌یەكان لەماوەی دو سەدەدا سێ جار ئایینی خۆیان گۆڕی. ئوسولی تۆرانی‌یەكان لەمەڕ ئیسلام‌و خەلافەت لە هەڵوێستی دژایەتی یان لە پەرستنی دروستكراوو مردووپەرستی‌یەوە هاتووە.

مێژووی تۆرانیان لەماوەی چەندان سەدەدا لە بەغداوە تا قاهیرەو ئاستانە شایەدی ئەم ئیدیعایەیە. توركان وێڕای خزمەتی سەربازی‌ی دوورودرێژی خۆیان دەستیان داوەتە چەندان شەڕی بێ پایان، بەڵام هیچ یەكیان لە پێناوی ئاییندا نەبووە، تەنیا ئەشق‌و حەزیان، گرتنی زەوی‌و وەدەست خستنی دەستكەوت (یان سادەتر بڵێین تاڵان‌و بڕۆ) بوو. ئەم بیابانگەڕە شەڕانی‌یانە خۆیان لەبەرامبەر هەستی عیرفانی‌و باس‌و خواسی ناسروشتی‌دا، كارلێكراو نیشان داوە.

بنیاتنەری ئیمپراتۆری مەغۆلی هیند وەردەگرت. (تورك یوردو) پڕ لە گوتاری وابوو کە لەرێو رەسمو ئاکارو نەژادو هۆزە تورکە دوورونزیکەکان دەدواو ستایشی «جیهانی فراوانی تورك»و «ئامانجی گەورەی میللی»ی ئەوانی دەکرد.



---

(١) لەنێو ئەوکەسایەتییە مێژووییانەی ضیاء بەگ ناویان دەبا، ئاتیلا (٤٠٦ ـ٤٥٣) پاشای هۆنەکان، ئەوەندە بەناوبانگە، پێویستی بە ناساندن نییە. دەڵێن گوتویەتی: «هەر جێگایەکی ئەسپەکەم پێی بخاتە سەر، هەرگیز گیای لێ شین نابێ!»

* ئەبو نەسر فارابی: دیارترین فەیلەسوفی ئێرانی پێش ئەبو عەلی سینا. لەساڵی ٨٨٠ لە (ماوەرائەنەهر)لەدایك بووە، لەساڵی ٩٥٠شدا مردوە. پێڕەوی رێبازی ئەرستۆی دەکردو نازناوی «مامۆستای دووەم»یان پێدابوو. خوێندنی لە بەغدا تەواوکردبوو. گەلێ نووسراوو نووسینی دەربارەی پزیشکی، ماتماتیك و فەلسەفە لەپاش بەجێماوە.

* ئەلەغ بەگ (١٣٩٤ـ١٤٤٩) نەوەی تەیموری ئەستێرەناس. (رەسەدخانە)ی سەمەرقەندی دامەزراندو جێگای (٢٤) ئەستێرەی دەستنیشان کردو شوێنی ٩٩٢ ئەستێرەی دیکەشی دیار کردەوە.

* ئەبو عەلی سینا (٩٨٠ـ١٠٣٧) حەکیمو فەیلەسوفی دیاری ئێرانی، بابی، ئێرانییەکی خەڵکی بەلخو دایکی خەڵکی تورکستان بوو. لەماوەی (٥٧) ساڵی تەمەنیدا زیاتر لە (١٥٠) کتێبو نووسراوی لەمەڕ زانیاریو هونەری جۆراوجۆر بەتایبەتی پزیشکیو فەلسەفە نووسی، سەرباری ئەمانە، چەند جارێکیش وەزارەتی (شەمس ئەلدەولە)ی دیلەمـــی بە ئەستۆوە گرت.

(٢) بەتایبەتی فوئاد بەگی کوپەرلوزادەی مامۆستای زانکۆ، دامەزرێنەرو سەرۆکی (ئەکادیمیای تورك)ی ئاستانە، زمانەوانێکی بەنێوبانگ کە لەم زەمینەیەدا سەرمایەیەکی دانا. ئەو لەساڵی ١٩٢٥ «تورکیات مەجموعەسی» کە بڵاوکراوەی دەزگای ناوبراوبوو، بڵاوکردەوە، بەرگی ئەم بڵاوکراوەیە بە مەشخەڵێك کە بە هێمای شارستانی دادەنری رازابۆوەو گورگی تورانی (کە ناوی «زینا» یان «بورچینا»یە) بەدەمی بەشو ددانە تیژەکانیەوە تێی راماوە.

بە پێی قسەکانی فوئاد بەگ، مەبەست لەم وێنەیە ئەوەبوو، توران مەیلی بەلای شارستانی بوونە. بەڵام نەزانراوە لەچ کاتێکدا گورگ لەباتی لەئاگر هەڵاتن، مەیلی دەکا؟ دەبێ بگوترێ ئەم جۆرە هێمایە تا رادەیەك بێ جێیە، بەتایبەتی ئەگەر باش لەوێنەکە وردبینەوە. وادێتە بەرچاو کە گورگ بە نەفسە دڕندەو خوێنخۆرییەکەوە دەیەوێ ئاگرەکە بکوژێنێتەوە.

# تاشەڕی یەکەمی جیهانی

شەڕی بالکان بۆ تورکان خولێکی پڕ جۆش و خرۆشی نائومێدیو ئومێدی تازەبوو، دوای شەڕی تەرابلووس کە خۆشبینی تورکە لاوەکانی لەرزاندبوو، شەڕی بالکان گوللەی بەزەیی لێدابوو«١». ئەم تێشکانە کارەساتانەی «رەعیەتە»کانی دوێنێ دەیانخولقاندن، ئەم زیانە گرانو قەرەبوو نەبۆوە هەڵبژاردەی تورکانی خستبووە نێو فیکرەوە. چینی ناوبراو تێگەیشتبوو کە شاهیدی لەبەریەك هەڵوەشانەوەی دەوڵەتێکە؛ سەردەمێ (بزالی و.ك) دەستووریی عوسمانی ئیدیعای دەکرد رزگاری کردووەو هێزێکی تازەی پێ بەخشیوە، ئەوکاردانەوە سروشتییەی بە هۆی ئەم بارودۆخەوە پەیدابووبوو، بیری رەخنەگرانەو هەڵسەنگاندنەوەی بەهاو هەڵێنجانەکانی پێشوو بوو.

گرووپێك پێیان باش بوو خەتای ئەم تێشکانە بخەنەملی «خیانەتی» نەتەوەکانی دانیشتووی ئیمپراتۆری کە بەزوویی بەشێك لەوان نەخشی (سوپەری بەلا)یان دیت. ئەم گرووپە بەدان نەنان بەبێ توانایی و بەزەیی ی چەندان سەدەی ئیمپراتۆری کە رژێمی«لیبرال» نەیتوانیبوو دەرمانیان بکاو بەهۆی بنچینەیی دان پێدانانو یاخی بوونی رەگەزە غەیرە تورکەکان دەژمێردراو بە سپڵەو خیانەتیان تاوانبار دەکردن. نەفرەتی سروشتی نەتەوەکان لەزوڵمو جەورو، داواکانیان بۆ سەربەخۆیی، بەدەسیسەی بێگانەو پیلانی سیاسی دانرا.

هەندێکی دیکە شوولیان لێ هەڵکێشار باوو باپیرانی خۆیان تاوانبارکرد. سوڵتان (موحەمەدی فاتیح) کە دەست بڵاوییەکەی بووە هۆی بەردەوامبوونی نەتەوەکانی نێو ئیمپراتوریەتو نەرمییەکەی هەتا شێوازی ژیانی کۆمەڵایەتیو ئیمتیازەکانی برەو پێ دابوون، هەروەها پێشینانی (موحەمەد فاتیح) (کە گیانی سەردەم مۆڵەتی دەدا هەموویان بخەنەسەر شمشیرەوە)، خۆیان لەکارێکی وا پاراستبوو، هەتا هەندێکیان هەقیان بە سوڵتان عەبدولحەمید دەدا کە پەنای وەبەر بنچینەیی ترین «رێگاچارەی» ئەم مەسەلەیە بردبوو. ئەوان رەخنەیان لە سستیو ناواقیع بینی حیزبی ئیتیحادو تەرەقی دەگرت، کە ئەوەندە بەخۆشباوەڕییەوە، گومانی دەکرد دەتوانێ میللەتێکی یەکپارچەو نیشتمانپەروەر لە «رەگەزی دوژمن» دروست بکا.

ئەم باری نائومێدیو نارەزاییە، ئەم مەیلە بۆ رەخنە لەخۆگرتن، زەمینەیەکی لەباری بۆ پروپاگندەی پان تورانیستەکان رەخساند، پێشبینییەکانیان وەدی هاتبوون: عوسمانیو یەکێتیی ئیسلام تێشکابوونو ئیمپراتوری بەیەکجاری بەرەو وێرانی دەچوو. «پیاوە نەخۆشەکەی ئەورووپا» ئاوزینگی دەکرد.

لەپر تورکەکان پشتیوانیێکی بەپەرۆشیان دۆزیەوە کە بەزەحمەت سەرچاوەکەیان دەناسی، پەیامی هان دانو هاوکاری لەنەتەوەو ناوچەکانی قەرم، قەفقاز، قازان، خیوە، تاشقەندەوە دەهات. دەستەی پارەهێنەر بە پەلە دەهاتنە ئاستانە؛ دەستەی پزیشکیی مانگی سوور، کەسایەتییەکان، ئەو ژنو پیاوانەی کە هەندێ کات بەرادەیەکی بەرچاو خوێندەواربوون.

لەسەردەمی دەستووریی عوسمانیدا بەبەرەکەتی هەولی بێ پسانەوەی پان تۆرانیستەکان، ژمارەی حاجیان بەشێوەیەکی هەست پێکراو زیادی کردبوو، ئەو حاجیانە لەکاتی تێپەربوونیاندا لە ئاستانە لەگەڵ برا هاوخوێنەکانیان ئاشنایەتییان پەیدا دەکردو بەم کارەیان بەکردەوە دەبوونە هەڵگری پەیامو پروپاگەندەی پان تۆرانیستەکان. ئەوان لەرێگای ئەنجومەنە تایبەتییەکان دەستیان بە پتەوکردنی پەیوەندی تورکانی عوسمانیو نەتەوە تۆرانییەکانی رووسیا، دەکرد. ئەم کارانە کە لەکاتی شەڕی بالکان ئەنجام دەدران، سەرەنجام بەری خۆیان دەدا.

لەشەوو رۆژێکدا، دەڵێی بەپەرچوو هەستی برایەتی هاتەکایەوە، واتە هەمان ئەو شتەی (ڤامبری) پێشتر پێشبینی کردووەو عوسمانییەکان هیچ بایەخێکیان پێ نەدابوو. ئەم هەستی برایەتییەی پێشتر لەلایەن رۆشنبیرانی تەتەرەوە پێشنیار کرابوو، جگە لە پێکەنینی گاڵتەئامیز هیچ کاردانەوەیەکی دیکەی نەوروژاندبوو.

یەکەمین کەس ئەم «ئارەزووە گەورە»یەی دەربڕی، خاتوو (خالیدە ئەدیب) بوو کە گوتی: «ئارەزوومە تەواوی تورکانی دنیا، گەورەییو سەربەخۆیی سیاسیو رۆشنبیری وەدەست بخەن»، ئەو سەردەمە هاوکاتی بێداری ژنانی تورك بوو کە لەماوەی چەندان سەدەدا لەژێر پەردەی حەرەمسەراکاندا شاردرابوونەوە. ئەوان کۆتاییان بە بێ هەستی چەندان سەدەی خۆیان کە دەستگەمەی مگێزی پیاوان بوون هێناو تێ کۆشان ببنە کەسایەتییەکی بە ئاکارو لێپرسراو، لەبەر هەندێش خوازیاری فێربوونو پەروەردەو چالاکی سیاسی بوون. بزاڤی ناوبراویش بێ پسانەوە لەگەل ناسیونالیزمێکی توندی نەژادیدا تێکەڵ بوو، چونکە خواستەکانی ژنان بەنێوی «خووڕەوشتی نەتەوەیی تۆرانی»و «ئەرك لەبەرامبەر نیشتمان کە لەمەترسی دایە»، دەربڕابوون.

ژنانی ئاستانە کۆبوونەوەیەکی فراوانیان لە (دارئەلفنون)ی ئەو شارەدا رێك خست. هەموو تورکە هەڵبژاردەکان لەشازادە خانمەکانی خانەدانی سولتانەوە بگرە تا خوێندکارانی ئاسایی بەشداربوون. (خالیدە ئەدیب) گوتارێکی دوورودرێژی دەربارەی رۆوشوێنی تۆرانیزمو رێبازەکەیدا، (خاتوو کەلثووم)یش هەمان شتی بەنێوی «تۆرانییەکانی رووسیا» گوتەوە. لەنێو جۆشو خرۆشێکی توندا کە گەیشتبووە رادەی شێتی، ئامادەبووان سروودی نیشتمانییان گوتو «قەمبیز»یان خواردەوە.

بەم شێوەیە، یەکەمین نیشانەی فراوانبوونی بزاڤەکە بەرەو خەڵك، دەرکەوتو زۆری پێنەچوو خەڵکیش رووژان، چینی رۆشنبیر لەلاو تا پیر خۆیان خستە نێو بزووتنەوەکەوە. نووسەرانی بەنێوبانگ بەرهەمەکانی پێشووی خۆیان سووتاندو بەریزی پان تۆرانیستەکانەوە پەیوەست بوون.

تۆفیق رەزا، جەلال نوریو سلێمان نەزیف هەرچەندە بەتووندی رکابەری یەکدیان دەکرد، یەك لەدوای یەك لایەنی «بیری نوێ»یان گرت. لەماوەیەکی زۆر کەمدا (کە باوەڕ نەدەکرا)، تەواوی چینی رۆشنبیر بووە پێرەوی بە پەرۆشو دەمارگرژی تورکچێتی.

چاپەمەنییەکانیش لەم وەرگۆڕانە خێرایەدا بەشداربوون: (ئیقدام)، بڵاوکراوەیەك کە پێشتر خۆی بەدوژمنی سوێندخواردووی «یەنی لسانەکان» دانابوو، لەشەو رۆژێکدا ناوی رۆژنامەو چاپخانەکەی خۆی کردە «ئیقدام یوردو».بڵاوکراوەیەکی هەڵگەڕاوەی دیکە «سەبیل ئەلرەشاد» بوو: پێش ئەوەی رێبازەکەی بگۆڕێو لاپەڕەکانی بۆ نووسەرانی وەك ئاقچۆرا، ئاقاییف، رەسوولزادەو ئەوانی دیکە ئاوەڵا بکا، خۆی بەدوژمنی سەرسەختی بیروڕای وا، ناساندبوو.

پێشبڕکێ لە پان تۆرانیزمدا گەیشتە رادەیەك کە رۆژنامەو گۆڤارە نارازییەکانی تورکچێتیش گچکەترین هەلیان دەقۆستەوە تا پەرۆشیو فیداکاریی خۆیان بۆ (خەت)ی نوێ بسەلمێنن. لەباتی کلیشەی «سووکایەتی کردن بە ئایینی پاك» کە پێشتر تایبەت بوو بەو کافرانەی لەلایەن خواپەرستانەوە قبووڵ نەدەکران، ئێستا زاراوەی «سووکایەتی بەتورکچێتی» باوبوو.

(ئەبو زیاء توفیق بەگ)، نووسەری سیاسی کە لەگوتارێکدا سەربازانی مەغۆلی جەنگیزخانی بەخوێن خۆر ناوبردبوو، لافاوێکی تووڕەییو نارەزایی بەم تێروانینە سادە مێژووییەی خۆی، وروژاندبوو: ئەمەش بووە هۆی داخستنی بڵاوکراوەکە کە سووکایەتی بە «شتە پیرۆزەکان» کردبوو. نیشتمانپەروەرە توندڕەوەکان هێرشیان کردەسەر (مەناکیان)ی دەرهێنەری بەرسەن ئەرمەن، چونکە لەشانۆگەرییەکدا «کاری دڕندانەی خەیاڵی خستۆتە ئەستۆی تەیموووری لەنگی رێبەری تەتەرەکان»و ناچاریان کرد داوای لێبووردنی خۆی بکا. ئەو «گوناهە»ی (مەناکیان) داوای لێبووردنی لێدەکرد، لەواقیعدا هی نوسەری شانۆگەرییەکە بوو، بەڵام خودی ئەویش خەتابار بوو چونکە بەهرەی خۆی خستبووە خزمەتی شانۆگەریی تورکیار بووبووە یەکێك لە پێشڕەوە دیارەکانی.

تورکان گەیشتبوونە قۆناغێك کە هەتا بەهۆی تێشکانەکانی، لەباتی دڵسۆزی، نەفرەتیان لە سولتان (ئیلدرم بایەزید«٢») دەکردو بەتایبەتی تاوانباریان دەکرد، چونکە رووبەرووی کەسایەتییەکی لەخۆی گەورەتر، تەیموووری لەنگ: رێبەری، گەورەی بنەماڵەی تۆرانی، بۆتەوە، مەگەر ئەو فەرامۆشی کردبوو؛ تەیموور «ئەم قارەمانە سەرکەوتووەی نەژادی باڵا، ئامانجی شتێك کەمتر لە بەرپاکردنی ئیمپراتۆریەتێکی جیهانیی مەغۆلو تەتەر نەبووە»).

لەگەڵ عوسمانیگەریدا، هەتا ئەو رێو رەسمەی کە باپیرەکەیان عوسمانە، وەلانا، تورکەکان خۆیان لەناو هێنانی دەگرت. یەکێك لە مامۆستایانی کۆلێژی ئەفسەری لە گوتارێکدا بەرامبەر کۆمەڵە ئەفسەرێك گوتی: «عوسمان کێیە؟ نازانم چما بە ئێمە دەڵێن عوسمانی؟».

«عوسمان ئەفسەرێکی ئالتایی بوو کە بە سوپا تورکەکەی خۆی ئەم وڵاتەی گرت.

ئەگەر ئێمە بەناوی نەتەوەیەك کە عوسمانی تێدابوە، بانگ بکەن، زۆرتر دەبێتە هۆی شانازیمان، هاوڕێیان، بەزوویی ئێمە هەموومان دەبینە ئەندامی سوپای قارەمانی تورك کە ئێمە لەسەرکەوتنێکەوە بۆ سەرکەوتنێکی دیکە ڕێبەریی دەکا. سەربازانتان فێربکەن کە تورکن‌و تاکاتێ بۆ تورکیاو ئالاکەی دەجەنگن، بەمسوڵگەری‌و هەمیشە سەردەکەون. بۆ ئێمە، نەتەوەی تورك لە ئیسلام بایەخی زیاترە، شانازی نەژادی گەورەترین فەزیلەتە».

لەهەمان دانیشتن‌دا، ئەفسەرێکی عەرەب بەناوی عوسمانیگەری‌و یەکێتی‌ی ئیسلام زمانی نارەزایی کردەوەو گوتی: «هەموو عوسمانیان تورك نین، ئەگەر ئیمپراتۆری بەم شێوەیە تێبگەین، هەموو ئەوانەی تورك نین لەباتی ئەوەی بەشێك لە پێکهاتی سیاسی زیندووی ئیمپراتۆری عوسمانی پێك بهێنن، بەبێگانە دەژمێردرێن.

ئەمما تورکەکان بڕیاریان دابو، ئیدی تێڕوانینەکانیان نەشارنەوە، گوتاربێژی ئەوێ ڕۆژێش هەر ئەو کارە دەکاو بەتوندی وەرام دەداتەوە:

«بزانن، واقیع لەگەڵ هەستی جوان جودایەو درووست نی‌یە یەکێك لەباتی ئەوی دیکە بژمێردرێ. مەگەر ئێوەو نەژادەکەتان ڕەعیەتی تورکان نین. مەگەر تورکان بە شمشێر وڵاتی ئێوەیان نەگرتووە؟ عوسمانیگەری کە هێمای بۆ دەکەی، حیلەیەکی سیاسی‌یەو ئێوە بۆ وەدی هێنانی ئامانجەکانتان سوودی لێ وەردەگرن. ئەمما ئایین هیچ پەیوەندی‌یەکی بە سیاسەتەوە نی‌یە.

ئێمە بەزوویی بەنێوی تورکیاو ئالای تورك دەچینە نێو شەڕەوە، بەبێ لەبەرچاوگرتنی ئایین کە مەسەلەیەکی ویژدانی تاکە کەسی‌و بەهەرحاڵ مەسەلەیەکی دواناوەندی‌یە. ئێوەو هاوڵاتی‌یەکانتان دەبێ لەمە تێبگەن: ئێوە تورکن‌و خەیاڵی وەك «میللەتی عەرەب» لەگۆڕێدا نی‌یە»(٣).

ئەمە نموونەیەك بوو لەو گوتارانەی کە تورکان یەك دوو مانگ، پێش ئەوەی لەگەڵ ئیمپراتۆری ئەڵماندا بچنە نێو شەڕی یەکەمی جیهانی‌یەوە، لە کۆبوونەوەکانیاندا، دەیاندا. پێش ماوەیەك، بڵاوکراوەی زۆر بڵاوی «ئیسلام مەجموعەسی» بە تورکچی‌یەکانەوە پەیوەست بووبوو، ئەمە، هەمان ئەو بڵاوکراوەیە بوو کە بۆ یەکەمین جار قورئانی کردبووە تورکی، کارێك پێشتر نەکراوو بەکوفر دەژمێردرا... لەسەردەمی (عەبدولحەمیدی دووەم)دا هەوڵێك لەم ڕێگایەدا درابوو. بەڵام ئەو هەموو دانە چاپکراوەکانی کۆکردبۆوەو سووتاندبوو. دوابەدوای وەرگێڕدراوی «ئیسلام مەجموعەسی»، دوو وەرگێڕدراوی دیکەش بڵاوکرانەوە. لەبەر هەندێ، لەماوەیەکی زۆر کەم‌دا، سێ وەرگێڕدراوی قورئان کەوتنە بەردەستی خەڵك. لەو مزگەفتانەی بەئامانجی تورکچی‌یەکانەوە پەیوەست بووبوون (خوتبەو وەعز) بەزمانی تورکی دەدران‌و ڕێورەسمی ئایینی بەزمانی عەرەبی بەرێوە نەدەچوو. هەندێکیان لەکاتی نوێژدا لەباتی رووکردنە قیبلە (مەکە)، بەرەو ڕۆژهەڵات‌و توران رادەوەستان.

نموونەیەکی تاکەکەسی دەتوانێ ئەم وەرگۆڕانە گەورەیەی لەماوەی چەندان ساڵدا لەگیانی تورکانی موسڵماندا رووی دابوو، نیشان بدا، لە بارێکدا لەساڵی ١٩٠٩ ڕۆژنامەی «یەنی گازتا» بەهۆی ئەوەی لەڕۆژی مەولوودی حەزرەتی موحەمەد (د.خ) دوعای تایبەتی لەلاپەڕەی یەکەمی ژمارەی ئەوێ ڕۆژێدا چاپ نەکردبوو، داخرابوو،

ڕۆژنامەی (ئیجتیهاد) دوای دەستپێکرانی شەڕی بالکان زنجیرە گوتارێکی لەژێر ناوی «خەبات لەدژی پیاوە ئایینییەکان»و زنجیرە گوتارێکی بەهەراو هۆرياتری لەژێر ناوی ئایا موحەممەد پەرکەمداربوو؟» بلاوکردەوە.

بلاوکردنەوەی گوتاری لەم جۆرە لەجیهانی ئیسلامدا باوەڕ نەکراور نەکراوبوو، بەلام ئێستا توران جورئەتی بەخۆیدەدا لەگەڵ قورئاندا (کە تا ئەودەم لەتورکیادا فەرمانڕەوای رەهابوو) بکەوێتە ململانێوە.

لەم قۆناغەوە تا جودایی دەوڵەت لەخەلافەتو هەلوەشانەوەی و، تورکی بوونو دنیایی بوونی دامەزراوەکانی ولات تەنیا هەنگاوێك بوو، پێویستی بەکات هەبوو، لەم قۆناغەدا، دەبوایە خەلك ئامادەو فێربکەن.

*****

ئەو کارانەی بزاڤی «نەتەوەیی» لەسالانی دەیەی ١٩٢٠ بە خێرایییەکی سەرسووڕهێنەر لەگۆڕانو وەرگۆڕانی بەشە ئایینیو کۆمەلایەتییەکاندا، ئەنجامیدا، بەری ئەو هەولانە بوو کە لەبیست سال پێشترەوە رێکخراوە پان تۆرانیستەکان بەتایبەتی «تورك بیلکی دورنەیی»و «تورك ئوجاقی» ئەنجامیان دابوو.

رێبەرایەتی پان تۆرانیست یەکەم جار «دەزگایەکی زانستی بەرز»ی بەناوی «تورك بیلکی دورنەیی» دامەزراند تا رۆشنبیرانی تورك بخەنە پلەی مێشکی رێبەریی کردنی بزافەکە، (تورك بیلکی درونەیی) «ئەکادیمیای زانستی تورك» کە ئامانجی خۆی لابردنی زاراوەی کۆنی فارسی (ئەنجومەنی زانست)و لەباتی ئەوە دانانی وشەی تورانی، رادەگەیاند، هەرچەندە لەلایەن حیزبی ئیتیحادو تەرەقییەوە پارێزگاری دەکراو رەسمیش نەبوو، بەلام دەولەت بودجەکەی دەدا. ئامانجی، بناغەدانانی رۆشنبیریو شارستانی تورك بوو، (ئەمرلال ئەفەندی) کۆنە وەزیری پەروەردەو فێرکردن بەرێوەی دەبردو زۆربەی چینی رۆشنبیری تورکیا ئەندامێتییان قبوڵ کردبوو. ئۆرگانەکەی «بیلکی مەجموعەسی» بەشێوەیەکی مانگانەو بەقەوارەیەکی گەورە بلاودەکرایەوە. ئەو گوتارانەی تیایدا بلاودەکرانەوە، لەلایەن ئەندامانی کۆمەلەوە دەنووسرانو لەسەرووی لاپەڕە یەکدا بەپیتی درشت دەنووسرا: «بەقەلەمی هەموو زانایانی گەورەی تورك».

«بیلکی دورنەیی» بەشی جۆراوجۆری هەبوو: ١. تورکیات (تورکناسی) ٢. ئیسلامیات (ئیسلامناسی) ٣. حیاتیات (ژیانناسی) ٤. فەلسەفەو ئیجتماعیات (فەلسەفەو کۆمەلایەتی) ٥. ریازیاتو مادیات (زانستی ماتماتیكو فیزیك) ٦. تورك چولوق (تورکچێتی) کە گرنگترین بەش بوو. دەستەی نووسەرانی، جۆرە کۆمیتەیەکی راپەڕاندن بوو کە دیارترین زماناس، هونەرمەند، ئابووری زان، پسپۆرانی پەروەردەو تەندروستی ولات ئەندام بوونو هەموویان تورکچی دەمار گرژبوون.

لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا، کارەکانی (بیلکی دورنەیی) زۆر ئەکادیمی بوونو خەلك سوودیان لێ وەرنەدەگرت. بۆ فێرکردنو پەروەردەکردنی کۆمەلانی خەلك، پان تۆرانسیتەکان ناچاربوون «تورك ئوجاقەکان» دامەزرێنن. یەکەمین کۆڕی لەم جۆرە لەسالی ١٩١٢ لە ئاستانە دامەزرا «وێڕای هەولی سەرنەکەوتووی «حەمدوللا سوبحی» لەسالی ١٩٠٩».

بەبۆنەی کردنەوەی «تورك ئوجاقی» شانۆگەرییەك پێشکەش کراو چینە جۆراوجۆرەکان ئامادەی بوون. بابەتی نوێ ئەوەبوو، رۆڵی ژنان لە شانۆگەرییەکەدا کە تا ئەودەم لەلایەن پیاوانەوە یاری دەکرا، بەخۆیان سپاردرابوو، بەشێکی گرنگی بانگ هێشتراوان - ئەفسەر، مامۆستایان، پزیشکو نووسەرو پارێزەرانو هیتر - هەرلەوێ داوای ئەندامێتی «تورك ئوجاق»یان مۆرکردو تەنیا ژمارەی پزیشکان (٧٠٠) کەس بوو، بەزوویی ئەندامانی ئەنجومەن گەیشتە (٣٠٠٠) سێ هەزارو نزیکەی (٢٥) هۆبەی لەشارەکان کرایەوە.

(تورك ئوجاقەکان) دەزگایەکی جودا لەحزبیان پێك دێنا، ئامانجیان زۆرتر نەتەوەیی بوو نەك نەژادی، ئەگەرچی بەرنامەیان (خوێندەوارکردنی میللەتی تورکیا، پێشکەوتنی فیکریو کۆمەلایەتیو ئابوورییانو گەشەپێدانی زمانی تورکو نەژادی تورك) بوو، بەلام لەیەکەمین رۆژەکانی ژیانیدا، دەرگایان بەرووی کەسانی غەیرە تورك (با موسلمانیش بن) داخرا. ئەو هۆیانەی بەکاریان دێنان: چالاکییانە، دەرسی شەوانە، گوتاردان، کۆڕی ئەدەبیو هونەری، بلاوکردنەوەی گۆفارو کتیبو دامەزراندنی خوێندنگا بوو. هەر پێنج شەممەیەك مامۆستایانی زانکۆی ئاستانەو خوێندنگا بالاکان لەوێدا گوتاریان دەدا. لە «خولەکانی شانازی»ی مێژووی تورك دەدوانو بلیمەتو قارەکانەکانیان ستایش دەکردن، رۆشنبیریی کۆنی تورك،هونەری جوانو هونەری سەربازی ئەوانیان دەخستەروو، دەربارەی «نەژادی کەونی تورکو ژیانو ئاکارو خوورەوشتی ئەوان» دەدوان.

وێڕای گوتاردان، فلیمیشیان نیشان دەداو ئەمە بەتووندی کاری لە کۆمەلانی خەلك دەکرد. رۆژانی هەینی، گوتاردانو نیشان دانی فیلم بۆ ژنان بوو. ئەوانەی گوتاریان دەدا، هەندێ جار پیاوو هەندێ جار ژن بوون. (خاتوو خالیدە ئەدیب) هەتا لە کۆبوونەوەی پیاوانیشدا گوتاری دەدا. لەسالی ١٩١٢دا دەرکەوتنی ژنێکی گوتاربێژ لەبەرامبەر پیاوان کە مێزەری سپیو کەسکی پیاوە ئایینییەکانی تێدا دەبینرا، بێ هیچ دوودلییەك رووداوێکی مێژوویی بوو. پێداویستییە سیاسییەکان پیاوە ئایینییەکانی ناچار دەکرد گوێ نەدەنە ئەم جۆرە مەسەلە کۆمەلایەتییانە (هەرچەندە هەزار سالەش بێ).

بەم شێوەیە «تورك ئوجاق» ئازادی ژنانی تورکی برەو پێ دەداو ژنی بە هۆیەکی بەبایەخی وەدی هاتنی ئامانجەکانی پان تۆرانیستی دەزانی. «تورك ئوجاق» کارێکی گرنگیشی لەنێو پیاوە ئایینییەکاندا ئەنجام دەدا. ئەو موفتییانەی پێشتر لایەنگری بێ ئەم لاو ئەولای یەکێتیی ئیسلامو رژێمی کۆنەپەرستیی عەبدولحەمید بوون، هێواش هێواش بەبەرەکەتی پروپاگەندەو یارمەتی دارایی «تورك ئوجاق»، دانیان بە بیرورای پان تۆرانیستی «نوێ کردنەوە» هێنا. هەتا «تورك ئوجاق» مالێکی بۆ خوێندکارانی زانستی ئایینی دامەزراند (وەك بەشی ناوخۆیی خوێندکاران لە رۆژئاوا)و خواردنو کەلوپەلی دەدانێو کردنیە ئاژیتاسۆری خۆی. ئەنجامی ئەو کارە رەزامەندبەخش بوو: بەزوویی ئامانجی عوسمانیگەری لەنێو کۆمەلانی خەلکدا جێگای خۆی بۆ تورکچێتیو دەمارگرژیی ئایینی جێگای خۆی بۆ دەمارگرژیی نەژادی چۆل کرد. بۆ یەکەمین جار شیعری وەك «من تورکم»و «توران» گەیشتە نێو خانەوادەی تورکان.

لەدەرەوەی تورکیاشدا خوێندکاران لەدەوری ئامانجە پان تۆرانیستەکان خڕبوونەوە. لەهەموو ئەو شارانەی زانکۆو ژمارەیەکی زۆری خوێندکارانی تورکیان لێبوو، لەنك «یانەکانی عوسمانی» کە پێشتر هەبوون «تورك یوردو»کان وەدەرکەوتن. خوێندکارانی غەیرە تورك لەئەندامێتی ئەم «یوردو»یانە بێ بەش بوون.

هەروەها بزافی تورکچێتی بایەخی بەپەروەردەی لەش دەدا. بەزانینی ئەوەی شەڕی چەند سەدەی دواییو دەوروبەرو شێوەی ژیانی کەمترخەمانە میللەتی تورکیان لاوازو «ژن سیفەت» کردووەو میللەتێك کە بەم شێوەیە لاواز بووبێ، توانای جیهانیی، سەبرو ئازایەتی باوو باپیرانی خۆی لەدەست داوە. ئوجاقیی‌یەکان ویستیان «ئامانجەکانی ئەمساك، تەندروستیو هیزی لەش»یان تێدا بژێننەوە. بۆ ئەم مەبەستە رێکخراوەکانی «تورك گوجو» (هێزی تورك) بۆ گەورانو (ئێزجی» (دیدەوان) بۆ مندالان دامەزرا. رێکخراوەکەی دوایی، ناوو بەرنامەکەی خۆی لە «فادفیندر»ەکانی ئەلمانەوە وەرگرتبوو، ئەگەرچی لایەنی پێشرەوایەتی (بەشێوازی ئەورووپایی) هەبوو، پێکهاتەکەی بە پێی رێو شوێنی تورکیای کەون بوو. هەر کۆمەلە، هەرپەلە، هەردەستە، ناوێکی تورکی لێبوو.

*****

تورکچی‌یەکان دەبوایە جلەوی مەسەلە ئابووری‌یەکانیش بگرنە دەست، تایبەتمەندی سەرەکی نەوەی تورکە لاوەکان ئەمەبوو کە دەرکیان بە بایەخی ئابووری کردبوو، نەفرەتیان لە بێ توانایی کاربەدەستانی نەوەی کۆن دەکردو ئەمەش خۆی لەخۆی‌دا نیشانەی وریابوونەوەیان بوو. زاراوەی «قەلەم»و «کاتب» کە لەلای نەوەی کوندا متمانەیەکی زۆریان هەبوو، ئێستا گالتەی پێ دەکرا. هەروەها نەوەی کەون تاوانبار کرا کە بەهۆی نەزانیو بایەخ نەدان بە بازرگانیو پیشەسازی، ئەم دوو شارەگە ژیانی‌یەی میللەتی بە بیگانان (هەلبەت مەبەستیان خەلکانی غەیرە تورك) سپاردووە.

بەم شێوەیە: چالاکی‌یەکی گەرمو گور بو وروژاندنی هەستی نەفرەت لە بێگانان دەستی پێ کرد کە ئامانجی لادانی خەلکانی غەیرە تورك لەو بوارەو سپاردنی کاروبارەکانی ژیانی رۆژانە بەدەستی «رۆلەکانی میللەت» بوو. بەکورتی لەو ماوە کەمەی کە ئاشتیو ئاسایش پێش دەست پێکردنی شەری یەکەمی جیهانی بەرقەراربوو، ئەم خەباتە بە پارێزو نهێنی ئەنجام دەدرا، بەتایبەتی ئەم دوژمنایەتی‌یە لەلای موسلمانانی غەیرە تورکدا دەشێردرایەوە. کۆمەلانی خەلکی نەخوێندەواری تورك وەك کاسبکارو پیشەگەر هێشتا ئەوەندەیان «ویژدانی نەتەوەیی» پەیدانەکردبوو شمشێر بەرووی ئایین‌دا هەلکێشن. لەبەر هەندێ تورکچی‌یەکان وایان بەباش زانی، ئەودەمی هەستی ئایینی خەلك نەرووشێنن. ئەنجومەنی پیشەکان هەمیشە لە تورکیا هەبوونە، کەشتی وانان، عارەبانچی‌یەکان، کۆلّ هەلگرەکان، بەقالەکان، قەسابەکان، هەریەکەیان لەلایەن سەردەستەی پیشەکانەوە سەرۆکایەتی دەکران. تورکچی‌یەکان ئەم یەکێتی‌یانەیان بەپێی ئوسولی تورکو ئیسلامی نوێ کردنەوە، بەشێوەیەك بتوانن لەرووی سیاسی‌یەوە بەکاریان بهێنن. ئیدی بەرژەوەندی پیشەیی ئامانجی سەرەکیو زنجیرەی پەیوەندی ئەم یەکێتی‌یانە نەبوو. ئامانجی تورکچێتی لە تێوەرپێچی ئایین‌دا جێگای گرتبۆوە.

بازرگانی موسلمانیش بەنۆرەی خۆیان لە یەکێتی بازرگانانی عوسمانیدا کۆبوونەوە. لەلایەنی دیکەدا بزووتنەوەی هەرەوەزی دەستی پێکرد. یەکێتیی بەکارهێنەران بەتایبەتی لەخولی کەم بوونی خواردنو نەبوونیی سەردەمی شەڕدا، وەك هۆکارێکی گرنگی پروپاگەندە لەدەستی تورکچییەکان دابوو. قەدەغەکردنی بەرهەم هێنانو بنکەی بازرگانی «بێگانە» (غەیرە تورك) بووە دیاردەیەکی ئاسایی‌و بەزۆریی لەگەل تۆلە، لە واقیعدا (تالانو بڕۆ) ئەنجام دەدرا. بیری تورانیزم لەزمینی خەلکو زاراوەی توران لەزمانی رەشە خەلکدا جێگیربووبوو، چێشتخانەکان، گازینۆکان، سەرتاشخانەکان زور بەشانازییەوەناوی تورانیان لەخۆیان دەنا. لەئاگاداری پروپاکندەدا، بەرگدرووەکان خۆیان بە «پیشەگەری تورك» دەناساند، دوو سیفەت کە تا ئەودەم بەتەواوی پێکەوە نەگونجاو بوون.

*****

تورکچییەکان دەبوایە بۆ پێشخستنی توانای دارایی ولاتەکەیان هەوڵ بدەن، لەلایەن وەزارەتی ئەوقافەوە سەرمایەیەکی یەك ملیۆن لیرەی عوسمانی بە مەبەستی دامەزراندنی بانکی نەتەوەییی تورکیا تەرخان کرا.

بانکە گچکەکان کە لەناوەندی پارێزگا جوربەجۆرەکانی ئەنادۆلی دامەزرابوون، یارمەتی داراییان دەدایە جوتیارە بێ دەرەتانەکان، بانکی کشتوکالیش بۆ هەمان مەبەست متمانەی گرنگی دەکردەوە.

تورکچییەکان بەبێ هیچ تێبینییەك هێرشیان کردەسەر هاوولاتییە ملیۆنێرەکانیان کە بەزۆری سامانیان لە بانکەکان دانابوو یان وەك مولکی دەست لێ نەدراوو بەکارنەهێنراو هێشترابوونەوە، تاوانی خائین‌و خوێن مژو شتی تریشیان بەسەرمایەدارانی غەیرە تورك بەتایبەتی ئەرمەنو یۆنانەکان دەگوت.

ئەمما زۆری پێ نەچوو، تورکەکان هەستیان بەبێ توانایی‌و بێ بەهرەیی خۆیان لە زەمینەی پێشبرکێی ئازاد کرد. هەمیشە دەمارگرژی بەبێ زانستو کار ڕێی نەکردووە. دامەزرێنەرانی بازرگانی‌و دارایی (تورك) بەسەرمایەیەکی گەورەو بەرزەفری کە جگە لەورووژانی نەژادپەرستی مەیلێکی دیکەی نەبوو، یەك لەدوای یەك دەستیان لەکارکێشایەوە یان بەغەیرە تورکیان ،ەسپێردران، ئەوانەی تێ دەکۆشان کارەکانیان درێژە پێ بدەن، ئامانجە سەرەتاییەکانی خۆیان فەرامۆش دەکردو بە پێشێل کردنی تەگەرەی یاسایی، کارمەندانی غەیرە تورکیان دادەمەزراندەوە. تورکەکان لە بەرامبەر ئەم (نایەکسانییە بێزارکەرە ئابوورییەی بەدرێژایی چەندان سەدە لەولاتی خۆیاندا بەزیانی ئەوان پەیدا بووبوو، لەبارێکدا بەبەهای خوێنی خۆیان لەبەرامبەر دوژمنانی بێگانە داکۆکییان لە نیشتمان دەکرد»، (هەروەها) تووشی توورەیییەکی زۆر بووبوون. بایەخێکی نەبوو کە خۆیان لەماوەی ئەمسەدانەدابەتالانوبڕۆی ئەوسامانە دەژیانکەئەم ،نەژادە ژێر دەستانە»بەئارەقەی نێوچاوانیان خڕیان کردبۆوە، بایەخێکی نەبوو کە ئەوانبەدرێژایی ئەم ماوەیە بە کوشتارە ناو بەناوەکەیان گەلێ زیاتر لەمەیدانی شەڕ خوێنیان رشتبوو. تورکەکان خۆیان وەك قوربانی چەوساندنەوەی ئابوورییەکی سەپێنراو دەزانی‌و جارێکی

دیکەش رۆڵی جوانی هەقخوازێکیان دەبینی کە هەقی خۆی دەویستو هاواری تۆڵەی لە جەرگەوە دەهاتە دەرێ. هەستی وا ژەهراوی جگە لەکاری «یەکسانی زۆرەملێ» ئەنجامێکی دیکەی نەدەبوو، بەواتایەکی دیکە، ئەو تالانو کوشتارەی لەسالانی شەڕی یەکەمی جیهانیدا ئەنجام درا.

دوای کۆدیتای ئەنوەر پاشا«٤»، حکومەت کە دووبارە کەوتبووە ژێر دەستەلاتی کۆمیتەی تورکە لاوەکان، ئامانجی پان تۆرانیستی بەهی خۆی زانی. هەموو وەزیران لە کۆبوونەوەکانی (تورك ئوجاق)دا بەشدار دەبوونو خۆیان بەئەندامی رەسمی ئەو رێکخراوە دەزانی. وەزیری پەروەردەو فێرکردن بەئاشکرا مامۆستای زانکۆو پەیمانگا بالاکانی لەنێو پان تۆرانیستەکانەوە هەلدەبژارد: ئەحمەد ئاقاییف، موحەممەد ئەمین، زیاء خالید، عەبدوللا بەگو ئەوانی دیکە. بەرنامەی خوێندنگا دەولەتی‌یەکان لە رەوزەوە تا زانکۆ لەگەل «ئاوازی پێشکەوتنی مەسەلەی نەتەوایەتی» گونجێنرابوون. لە خوێندنگا عەسکەری‌یەکاندا نە تەنیا مێژووی تۆران، بەلکو هونەرو نووسینی ستراتیژیكو یاسای عەسکەری تۆران دەخوێندران.

«ئیستلاح ئەنجومەنی» (کۆمیتەی زاراوەی زانستیو هونەری لەوەزارەتی پەروەردەو فێرکردن) دەستی کرد بە دانانی وشەی تورکی لەجێگای زاراوەی ئەوروپایی کە تا ئەودەم لە کارە هونەری‌یەکاندا بەکاردەهات، «تەئلیفو تەرجومە ئەنجومەنی» (کۆمیتەی دانانو وەرگێران، خەریکی بلاوکردنەوەو وەرگێرانی ئەو کتێبانە بوو کە بۆ پێشخستنی رۆشنبیری تورکی بەسوودبوون، لەدواییدا وەزارەتی پەروەردەو فێرکردن دەستی کرد بە فراوان کردنی رێکخراوی لاوان «ئیزجی»و لەهەموو خوێندنگاکاندا هۆبەی بۆ کردەوە. تەواوی خوێندکاران کەوتنە ژێر کاریگەری پروپاگەندەی شۆفێنستی.

چالاکی‌ی وەزارەتی ئەوقاف بنچینەیی‌تربوو، هەموو ئەو یارمەتی‌یە سەخاوەتمەندانەی دەگرتەخۆ کە پێشکەشی بزافی تورکچێتی دەکران. ئەم کۆمەکانە لەرێگای دیاری‌و وەسیەتەوە دەهاتن. بەیارمەتی وەزارەتی ئەوقاف بانکی نەتەوەیی تورك دامەزراو هەروەها بەیارمەتی پەنجا هەزار لیرەیی ئەم وەزارەتە چەند کتێبێکی گرنگ دەربارەی هۆلاکۆو جەنگیزو تەیموور، بلاوکرانەوە.

وەزارەتی ئەوقاف بە پێی نموونەی کۆمەلگای رۆژئاوا سیستەمێکی فێرکردنی سەربەخۆی لە بودجەی دەولەت دروست کردو کردی‌یە هۆیەکی بەتەواوی ملکەچ لەدەستی پروپاگندەی ناسیونالیستی‌و نەژادپەرستانەی خۆی. تێکۆشا «خوێندنگاکان کە لەکۆنەوە بنکەی بیروباوەری ئایینی بوون، بگورێ، ئەم جۆرە هۆکارە زەینی‌و ئەم هەستە توندانە دەبوایە بەرەو ئامانجی نوێ رێبەریی بکرێنو لەخزمەتی پروپاگندە دابن. لەئەنجامدا، بەزوویی (حەوزەی علمیە)ی نوێ دامەزران کە هوکاری نوێ تیایاندا گوتنەوەی زانستی تورکناسی بوو«٥»».

لەوان دەماندا لەلایەن دەولەتەوە چەند هەولێك بو کەم کردنەوەی دەستەلاتی (شەریعەت) لەرێگای فراوان کردنی دەستەلاتی عورفی، درا. لەم کارەدا (شێخ ئەلئیسلامەکانی) پان تۆرانیستو لایەنگری حیزبی ئیتیحادو تەرەقی نەخشێکی گرنگو پڕ بەهایان گێرا. ئەوان تاکتیکێکی سەرنج راکێشیان بەکارهێنا: یەکێك لە (شێخ

ئەلئیسلامەکان) بانگی نارەزایی دژی ئەم جۆرە کارانە بەرز کردەوەو وازی هێنا، بەم کارەی خۆی پایەگای کەسایەتی خۆی کردە قوربانی «ئامانج». جێگری ئەو دەیتوانی کاری ئەنجام دراو بەئاسانی قبوڵ نەکا.

سەرەنجام تەلعەت پاشای وەزیری ناوخۆو ئەندامی کاریگەری ئیتیحادو تەرەقی، سوودی لەدەستەڵاتو توانای خۆی وەرگرت بۆ پێکهێنانی رێکخراوێکی بەمتمانەی بەرێوەبەرایەتی، ئەویش دانانی تورکچی‌یەکان لە کارە گرنگەکانو (بەتورك کردنی) رێکخراوە دەوڵەتی‌یەکان بوو. ئەم ئوسولە لەمەڕ پارێزگار، قایمقامو بەرێوەبەرانی شارەوانی بەکارهێنراو رێگای خۆش کرد پان تۆرانیستی بەنێوبانگی وەك موحەممەد ئەمین، جەلال، حوسێن کازمو ئەوانی دیکە بگەنە شوێنە بالاکانی بەرێوەبەرایەتی. بەم شێوەیە تورکەکان رووی خۆیان بەرەو ئەناتولی، ناوکی نارەندی دەوڵەت وەرگێراو رژێم لێهاتووترین ئەندامی بۆ ئەو ناوچەیەنارد تا بەشێوەیەکی زۆر فراوان دەست بە (تورکی کردن)ی وڵات بکەن.

تەنیا کوشتاری ترسناکی سالی ١٩١٥ بوو کە پاشان ئەو تاوانە درندانانەی لە وەزارەتی تەلعەت دارێژرابوون، مەبەستی واقیعیو قەوارەکەیان ئاشکرا کرد. ئەم بەرنامەیە جگە لە بەتورکی کردنی (ئەکادیمیو رۆشنبیری)، شتێکی دیکەش بوو.

*****

لەم چالاکی‌یە وروژاوەی لەهەناوی وڵاتدا ئەنجام دەدرا، تورکەکان نەتەوە تورانی‌یەکانی دیکەیان فەرامۆش نەکردبوو، بەڵکو بە پێچەوانەوە بۆ ئەوانیش بەرنامەیان هەبوو. ئەنوەر پاشا پێشتر لەرێگای ئەو دەستانەی لە رووسیاوە هاتبوون، پەیوەندی پێوە کردبوونو لەمەڕ هەندێ ئوسول تەواو رێك کەوتبوون. کەمێك دوای سالی ١٩١٣ کۆنگرەی پان تۆرانیستەکان لە بایەزید (ولایەتی ئەرمەننشینی هاوسنووری رووسیە!) بەستراو بریاری لە «یەکگرتنی دوو لکی رۆژئاواییو رۆژهەلاتی میللەتی تورکدا» (واتە ئاسیای گچکەو قەفقاز)و پشتگیری لە پەیمانی هاواری نێوانیان کرد «٦» ئەو رێگایەی کۆنگرە نەخشەی بۆ کێشا هەمان ئەو رێگایە بوو کە تورکانی عوسمانیو ئازەری لەماوەی شەڕی یەکەمی جیهانیدا گرتیانەبەر.

ئەم رووداوانە لەسالی ١٩١٣ روویاندا، واتە کاتێ وادەهاتە بەرچاو دیپلوماسی‌ی نێو دەوڵەتان بۆ یەکەمین جار بەجیددی پەیوەندی بەمەسەلەی ئەرمەنەوە پەیداکردبیو بەگشتی دەنگ بریار لەچارەسەرکردنی بدا. وەختێ لەنێو کۆری ئەرمەنانەدا ئومێدی ئەوە هەبوو ولایەتە بەخت وەرگەراوەکانی ئەرمەن نشین کەمێك نیعمەتی ئاشتیو ئارامی وەرگرنو ریفۆرمی بەرێوەبەرایەتی کە لەمێژبوو گفت درابوو، لەژێر چاودێری پشکنەرە ئەورووپایی‌یەکاندا ئەنجام بدرێ رێك لەوان دەمان بوو کە «دوولکی میللەتی تورك» لەسەرووی ئەرمەنەکانی رۆژئاواو رۆژهەلات بەرنامەی یەکگرتنیان رێك دەخست کە لەقۆناغی هەوەڵدا، هەرەشەی لەنێو بردنیشی لێدەکرا.

بەم شێوەیە شەری بالکان بەخالێکی گۆرانی مێژوویی دەژمێردرێ کە تورکەکان

روویان لە ئیسلام وەرگێرا تا رێوڕەسمی پان تۆرانیزم قبوڵ بکەن؛ دانیان بە عوسمانۆ ئوسولی عوسمانیان کە یەکێتی نەتەوە جۆراوجۆرەکانی نێو یەك ئیمپراتوری بوو، نە نا تا خۆیان بەناوی تورکو رۆڵەی تورك لەدەوڵەتێکی نەتەوەیی یەکدەستدا ببیننەوە.

دەرکی ئەم مەسەلەیە نیشانی دەدا کەچما تورکە «نوێ»کان گوێیان بەجودایی یەك لەدوای یەکی چەند بەشێکی خاکی ئیمپراتۆری نەدەدا. ئەوان بەپێچەوانەوە ئەم ناوچە لەدەست چوانەیان «کە دانیشتوانیان بەزۆری نەتەوەی ئاژاوەگێربوونو هەمیشە دەکەوتنە بەر مەترسی دەرەکی» بەبارێکی گران دەزانیو رایان وابوو نرخی ئەو ماندووبوونەی نەدێنا کە بۆ پاراستنیان دەکرا. دەیانگوت:

«ئەوان باشترین بەشی وزەی تورکیان خەرج کردووەو رێگایان لەبەکارهێنانی، لەزەمینەکانی دیکە گرتووە... لەهەلومەرجێکی وادا تورکیا ناتوانێ لەباری رکودەوە دەرچێو بچێتە جادەی نوێ بوونەوە، ئەگەر خۆی لەشەڕی ئەم «باری گرانی ئیمپراتۆری»یە رزگار نەکا. ئەودەم، تورکیا بەم کارە کە لەکۆتایی سەدەی هەژدەدا گومان دەکرا لەسەرمەرگدابێ، بەکردەوە سەری بەرزکردۆتەوەو دوابەدوای ئەوەی هەرجارەی بەشێکی خاکەکەی لەدەست دەدا، هێزەکانی کۆدەکاتەوە».

لەروانگەی تورکە «نوێ»کاندا، لەدەستدانی خاك کە بەتێروانینی هەندێك، کارەسات بوو، جگە لەکارێکی نەشتەرگەریی سەلامەتبەخش شتێکی دیکە نەبوو، دەرمانێ پیاوە نەخۆشەکەی دەرمانو بەهێزدەکرد. بۆئەوەی جارێکی دیکەش هێما بۆ بەلگەکانی ئەوان کە پربوون لەو جۆرە خوازراوانە، بکەین، دەیانگوت ئەم کارە بواری داوە لە کوتایی هاتنی تەمەنی ئیمپراتۆری ئەم نەخۆشییە چەند سەدەییەیە، لەنێو خۆلەمیشەکەیدا، تورکانی لاو لەدایك بن. دیسان بە گەرمو گوڕییەوە پەنایان بۆ شیکردنەوەیەکی دیکە دەبرد کە بەو پێیە «تورکیا لەبەرامبەر چەند ولایەتێکی ئەورووپایی لەدەست چوو، ولاتی ئایدیالی خۆی، سەرزەوی باپیرانی ئەنادۆلی لەئاسیا وەدەست هێناوە».

دوابەدوای هەریەك لەو تێشکانانەی عوسمانییەکان کە لەئەنجامیدا زەوی لەدەست دەدراو لەمێژووشدا تۆمارکراوە، ئەوان بە «غەریزەیەکی سیاسی تەواو» دەسەلاتی خۆیان بەسەر ئەنادۆلیدا مکووم دەکردو تا رادەیەك سەرکەوتووانە تێ دەکۆشان دەسەلاتی رەسمی خۆیان لەو ناوچەیەدا بگەیەننە قۆناغی کار.

ئەمما دوای شەڕی بالکان بوو، رێبەرانی تورك بەواقیعی پەیان بە قوولی پێشنیارەکانی مولتکە برد کە تورکیا دەسەلاتێکی ئاسیاییەیە نەك ئەورووپاییو دەبێ لەئاسیادا هێزی ژیانی خۆی بدۆزێتەوە. لەبەر هەندێ دەبێ تورکەکان بەبەرنامە نیگای خۆیان بەرەو کۆمەلانی خەلکی تورك ئاراستە بکەن (ئەو شوێنەی لێیەوە هاتوون).

تورکیا کۆتایی بەو زنجیرە پاشەکشێیە دێنا کە لە تێشکانی دەروازەی فیەنناوە دەستی پێ کردبوو، و بەویستو مەیلەوە «بەرەو رۆژهەلات دەچوو»؛ جێگایەك کەملیۆنان برای هاونەژاد چاوەرێیان دەکرد. دروشمی بەنێوبانگی گلادستۆن لەمەر دەرکردنی تەواوو بێزراوی تورکان لە دامەنی ئەورووپا «بەهەگبەو بارگەو بنە»وە لەروانگەی

دەرکراواندا بەرەکەت بوو. دوای گرژبوونەوەیەکی چەند سەدەیی، ئێستا نۆرەی بزووتنی فراوان بوونێکە یان بەلایەنی کەمەوە ویستی بەرەو ئاسیا چوون کە بەکردەوەش تا رادەیەك ئاشکرادەبوو. لەبەر هەندێ تورکەکان ویڕای تێشکانە بێزراوەکانیانو لاوازی سیاسی ولاتەکەیان، هەستێکی خۆشبینی‌یان لەکن پەیدابووبوو. ئەویش لە بەڵگەهێنانەوەکانی تورکە لاوەکان لەمەڕ شانازی‌یەکانی رابردوو، ئایندە سەرچاوەی هەڵدەبەست.

حسین جاهید بەگ ئەم بابەتەی لە رۆژنامەی (تەنین) بەم شێوەیە دەربڕی: «تێشکان لەشەڕەکانی بالکان لەرووی ماددی، لەئاسۆی مێژووی میللەتی تورکدا، سەرکەوتنێکی مەعنەوی‌یە».

ئەمما لەمەڕ نوێبوونەوە، چ شتێك لەتورکیا جارێکی دی لەدایك دەبوو؟ «نوێبوونەوەی نەتەوەیی» بەناچاری مانای «نوێبوونەوەی گیانی» واتە باوەرهێنان بەرێو شوێنی بەراستی پێشکەوتووترو بالاترو ئامانجی مرۆڤانەتر، نادا، ئەوەی لەدایك دەبێ یان لەواقیعدا لەدایك دەبێتەوە، هەمان ئەو شتانەیە کە پێشتر بەشێوەیەکی نەخشەکێشراو هەبوونەو گەوهەری کۆمەڵەیەکی نەژادی دیاریکراوەو رەسەنایەتی باوەڕەکانی پێك دێنێ. لەپێناوی لێکۆڵینەوەی مێژوو، نەژادی نەتەوەیەك، دەبێ هەمیشە ئەم جودایی‌یە لەبەرچاو بگیرێ، لەبیربردنەوەی ئەم بنچینەیەو رەچاوکردنی تایبەتمەندێتی هەر کۆمەڵەیەك بەتایبەتی رێوشوێنی شیکردنەوەی مەیدانیو دەروونناسی نەژادیو مێژوویی، ئێمە بەرەو گومرایی دەبا. بەلەبەرچاوگرتنی ئەم پرانسیپە دەروونناسی‌یە نەژادی‌یە، تەواوی نەژادە

تورکو هێلی بنچینەیی سیفەتەکانی، بۆ ئێمە ناسراوە: بەڵگەی زۆر لاواز، نەفرەتی توند لەهەر جۆرە مەسەلەیەکی موجەرەدو دوودڵی ئامانجگەری، مەیل بەژیانی بێ هودە، پارەپەرستی، شەرەنگێزیو توندوتیژی. ئەم سیفەتە سەلبی‌یانە لەگەل لایەنە ئیجابی‌یەکانی‌دا، کە بە فەزیلەی سەرەتایی نەژادە بیابانگەرەکان دەژمێردرێن: ئەشقی دەمارگرژ ئامێز بەخاکو ئالا، ئازایەتی بەرگەگرتنو قەناعەت، گیانی هاوکاریو دیسپلین، هەستی واقیع بینی عەسکەری، هەستی رێکخراوەیی عەسکەری، شەهامەتو ئیرادە... کۆمەڵە سیفەتێکی پێویست بۆ خولقاندنی نەتەوەیەکی دەستەلاتدارو داگیرکەرو هەروەها کۆمەڵە سیفەتێکی پێویستی خولقاندنی جەنگاوەرانی باشو هاوولاتیانی خراپ، سەردارانی باشو کارگێرانی خراپ، لەشکرێکی باشو حکومەتێکی خراپ... پوختەی قسە، سیفاتی باشو هەتا بەرز کاتێ پەیوەندی بە خرکردنەوەی سوپا، هێرش‌کردن، گرتنی ولاتێك، تالان، سەرکوتو وێرانی‌یەوە هەیە. بەلام هیچ جۆرە مەیلێکیان بە بنیاتنانەوە نی‌یە. هەر کە شەر تەواودەبێ، هەر کە شمشێرەکان دەچنەوە کالان، پیاوچاکی‌ی سەردەمی شەر بەرەو لاوازی دەچێ، سەربازانی ئازای دوێنێ لەسەر شانازی‌یەکانیان دەخەونو ئەو دەستکەوتانەی لەشەردا وەدەستیان هێناون لەکەمتەرخەمیو رابواردندا خەرجی دەکەن... تا جارێکی دیکە شەیپوری شەڕ لێ بدەنەوەو (فاتیحی) خەوتوو واگا بێنن، مگێزی دەستکەوت دەوروژێنێ، مامزە لەئەسپەکەی دەدا، شمشێرە خوارەکەی لە کالان دەردەکێشێ. دروشمێ کە تورکان بەشانازی‌یەکی زۆرەوە دەیلێنەوە،

ئەمەیە «ئێمە میللەتێکی جەنگاوەرین!».
هەمان ناسنامەی بەکۆمەڵ، ئاژاوەچی، جەنگاوەرو شەرانگێز بوو کە لەنەژادی تورکدا لەدایك دەبۆوە. ئێستا چینی فەرمانڕەوای تورك ئیدی بەکاری زۆرەملێو گوشارو «رەعیەتی» لاوازو بێ چەك، رازی نەدەبوو، بەدەستێکی زۆر بەوردی خەریکی بەرنامەدانان بوو بۆ لەناوبردنی تەواوی ئەو نەتەوانەو بەدەستەکەی دیکەی خەریکی ئەنجام دانی کارێکی بێباکانەتربوو: پێکهێنانی ئیمپراتۆریەتێکی فراوانی تورکو تەتەر کە بەهێزی چەکو پشتیوانی نەتەوە تورانی‌یە براکانو وڵاتانی میحوەر بتوانن جارێکی دیکە رۆژهەڵاتو رۆژئاوا بلەرزێنن.
مەبەستی وا لەبەریەوەبەرایەتی‌و تەلاری کۆبوونەوەی کۆشکەکانی دەوڵەت بەهیچ شێوەیەك نەدەشێردرایەوە. لە کوچەو بازارو بەشێوەی «نوێبوونەوەی تورکان» دەنگی دەدایەوە. کەژاوەیەکی مەزن بوو کە لەبەرایی‌دا ئاڵای سۆر لە رۆژو مەشخەڵی هەڵایسار لەشەودا دەرۆیشتو هاوارەکانی، جادەکانی ئاستانەی پڕ دەکرد. «یادکردنەوەی نەتەوەیی» لەچینە جۆراوجۆرەکان. لەخوێندکاری زانکۆوە تا کۆڵ هەڵگرەکان پێك دەهاتو هەرجارەی بۆ زیارەتی گۆڕی (سولتان موحەممەدی فاتیح)و (سولتان سولێمانی قانونی) وەرێ دەکەوت، ئارەزووی خۆی بە «تۆڵەی ترسناك» دەردەبڕی.

لافاوی سەرکەوتوانەی نەفرەتی نەژادی لەسەر رێگای خۆی‌دا، ساختمانی «برایەتی عوسمانی» وەك ساختمانێك لەسەر لمدا بنیات نرابێ، وێران دەکردو راپێچی دەدا، چینی رۆشنبیری نەتەوە ژێردەستەکان کە هێشتا دەستەویەخەی خەون بوو، لەبێداری ویژدانی نەتەوەیی لەنێو تورکاندا» شێتو شەیدابووبوو. بەتایبەتی ئەرمەنەکان کە زۆربەی رێبەرە سیاسی‌یەکانیان ئومێدەواربوون «رەگەزی تورك، پەی بەنرخو قازانجی پێکهاتی نەتەوایەتی ئیمپراتۆری بردبێ» لەدواییدا، لەمەڕ نەتەوەکانی چوارچێوەی ئیمپراتۆری، لەبەرچاوی بگرنو هەتا بۆ سەربەخۆیی نێوخۆش هانیان بدەن. ئەوان، وەدەرکەوتنی گورگی تورانی‌یان لەئاسۆی سیاسی تورکیادا بەنیشانەی سووکتر بوونی رەنجەکانی ئەرمەنستانو جێگیربوونی کۆنفدراسیۆنێك لەنەتەوەکانی عوسمانی، دەزانی. دئەمما ئەوەی گورگی تورانی لەمێشکی دابوو، کۆکردنەوەی بێچووە گورگەکان بەمەبەستی هەڵدرینی خەڵکانی تربوو. لەباتی ئەوەی بەرەو کۆنفدراسیۆنی نەتەوەکانی عوسمانی ببزوێ، بەرەو کۆنفدراسیۆنی نەتەوەکانی تۆرانی هەنگاوی هەڵێنا.
ئەمەبوو باروودۆخی پان تورانیزم لەتورکیا پێش شەڕی ۱۹۱٤. بزافی کە لەژێر پەردەی بزووتنەوەی زانکۆو رۆشنبیری‌دا لەرۆژانی پێش شەڕی یەکەمی جیهانی‌دا دەستی پێکردبوو بەخێرایی دەبووە سیاسی‌و هەتا لەرادەبەدەر بووبووە سیاسی.
ئەو بەرنامەو رێگایانەی دەست نیشانی کردبوون، دیاری کردنو هەتا زەمینەی چەند یەکێتی‌یەتیشی خۆش کردبوو. ئێستا بزافەکە گینگلی دەدا، بەبێ سەبری سمی لەزەوی دەدار چاوەڕوانی دەمی کاربوو.

---

۱. مەبەست لەشەڕەکانی تەرابلووس‌و بالکان، ئەو شەڕانەن کە لە ئەنجامدا لیبیا لەلایەن دەوڵەتی

ئیعالیاوە لە ئیمپراتۆری عوسمانی سەنرا (١٩١١)و ناوچەکانی سربستانو بولغارستانو یونانو مونتەنیگرۆی لەدەستدا (١٩١٢). لەلۆزانی دووەمی شەڕی بالکاندا (١٩١٣)، رومانیاو یونانو عوسمانی بۆ بەرگری کردن لە سربستان دژی بولغارستان چوونە نێو شەڕەوە (و.ف)

٢. ئیلدرم بایەزید، سولتانی عوسمانی (١٣٥٤-١٤٠٣) لەلایەن تەیمووری لەنگەوە تێشکاو بەدیل گیراو بەفەرمانی تەیموور خرا نێو قەفەزێکی ئاسنینەوە. دوای هەشت مانگان، وەزگی داو مرد، عوسمانییەکان تا ئەو دەمەی مەیلی پان تۆرانیستییان پەیدانەکردبوو، بایەزیدیان ب شەهیدو تەیمووریان بە جەللادێکی دڕندە دەزانی.

٣. CE, ~Le Fanatisme Panture~ LAsie Francaise, ayril - juin 1917, p.72.

٤. دوابەدوای گیرانی لیبیا لەلایەن ئیعالیاو دەرکرانی تەواوی عوسمانییەکان لەقەلەمڕەوی ئەورووپاییەکانیان، کۆمیتەی حزبی ئیتیحادو تەرەقی کە بەحزبی فەرمانڕەوای عوسمانی دەژمێردرا، قەیرانێکی گەورە خولقا. ئەم قەیرانە خۆی بەشێوەی جودایی نێوخۆییو نارەزایی توونداو رۆژ بەرۆژ زۆرتری هێزە سیاسییە دژەکان، نیشان دەدا، لەبارودۆخێکی وابوو کە لەکانوونی دووەمی ١٩١٣ ئەنوەر پاشا لە کۆدیتایەکدا هێرشی کردە سەر (بابی عالی)و دوای کوشتنی وەزیری بەرگری، دەسەڵاتی گرتەدەست. (و.ف).

٥. چالاکییەکانی وەزارەتی ئەوقاف، لایەنێکی سرنج راکێش تریشی هەبوو، خولقاندنی شێوازی بیناسازی تورکی هاوچەرخ. بەبودجەی ئەم وەزارەتە چەند ساختمانێك بەشێوازی کردنی تورك دروست کران. رێبەری ئەم بزاڤە (کمال‌الدین بەگ) بوو کە ئەندازیارێکی میعماری دەرچووی ئەلمان بوو. چەند سەرمایەدارێکی تورك لە ئاستانەو شارەکانی دیکە، هەندێ کۆشکیان بەهەمان شێواز دروست کرد. وەزارەتی ئەوقاف، هەروەها دەستی بەسەر کتێبخانەی (کەتانۆف)ی رۆژهەڵاتناسی بەنێوبانگی رووسی کە پڕ لەکتێبی تورکناسی بوو، داگرتو کردییە «کتێبخانەی نەتەوەیی».

٦. نوێنەرانی ئازەربایجانی لەقفقاز لەم کۆنگرەیەدا بریتی بوون لە: ئەحمەد ئاقاییف، رەسوولزادەو تۆپچی باشی یف، دەربارەی ئەم کۆنگرەیەی پان تۆرانیست کە لەرۆژانی بەر لەشەڕی یەکەمی جیهانیدا پێك هاتو بولغارەکانیش بەشداربوون، لەوە زیاتر شتێکی دیکە نازانین.

# پان تورانیزم
# لەسالآنی شەڕی یەکەمی جیهانیدا

پان تورانیزم بزافێکە بەتایبەتی لەدژی رووسیا پێك هاتبوو، چونکە زۆرترین بەشی «توران ئیردنتا» کەوتبووە ژێر دەستەلآتی رووسەکان. لەبەشەکانی پێشتر بەدرێژی لەوە دراین کە چۆن پان تورانیستەکان تێدەکۆشان، کۆمەلآنی خەلك بەتایبەتی دژی «مۆسکوییە درندەکان»و «دێوی چەوسێنەری خەلك» بورووژێنن.

لەرۆژانی بەر لەشەڕ، ئەم جۆرە پروپاگندەو مەیلانە بەخاتری مەسەلەی ریفۆرم لە ویلایەتەکانی رۆژهەلآت«١» لەبیرەودابوون کە لەروانگەی تورکاندا جگە لە «دەمەزیەکی تازەی دیپلوماسی ئیمپریالیستی رووسیو هێرشێکی نوێ، دوای شەڕی بالکان» شتێکی دیکە نەبوون.

بەباوەری تورکان، مەسەلەی ئەرمەنەکان بەشێوەیەکی گشتی پیلانێکی رووسی بوو کە بەمەبەستی زیاتر گوشار خستنە سەر تورکیا راچێنرابوو. شۆرشگێرانی ئەرمەنی (کە بەئەرمەنەکانی رووسیا نێو دەبران) کارمەندانی کرێ گرتەی رووسیا بوون کە دەیانویست ئەرمەنستانێکی سەربەخۆ لە رۆژهەلآتی تورکیا دامەزرێنن. هۆی ئەم کارە:

ئەلف: رێگاگرتن لە پێکهێنانی تورکیایەکی یەکدەستەو بەهێز کە تورکچییەکان دەیانویست بە یەکسانکردن یان لەنێوبردنی نەتەوەکانی نێو ئیمپراتۆریەت دروستی بکەن (تورکان تەئکیدیان دەکرد کە بەرژەوەندییەکانی روسیا وا دەخوازێ لەسنوورەکانی خوارێدا ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لاوازو دووبەرەکی هەبێ، لەباریکدا وەدی هاتنی ئامانجەکانی تورکچییەکان، پێکهاتنی تورکیایەکی یەکگرتوو، بەهێزو لەئاکامدا ترسناك بوو.

بێ: رێگاگرتن لەپێشرەوی پان تۆرانیزمی تورکیا بەرەو نەتەوە تورانییەکانی رووسیا، لەم رێگایەدا رووسەکان تەگەرەیەکی کاتییان بە ئەرمەنستانی رۆژئاوا خولقاندووە تا ئەو دەمەی خۆیان بتوانن ئەم ناوچە ستراتیژیکە زۆر گرنگانە لەفەلآتی ئەرمەنستان، بگرن.

جیم: ئامادەکردنی سەنگەرەکانی پێشەوە بۆ چوون بەرەو «ئاوە گەرمەکان» واتە دوورگەکانی دەریای (ئیجە) و دەریای ناوەراست.

لەروانگەی تورکاندا، سەرەنجام کاتەو هەلی گونجاو بۆ پووچەڵ کردنەوەی ئەم پلانە رووسییەو جێبەجێکردنی ئامانجەکانیان، دێ.

ئامانجە ناوبراوەکان بریتی بوون لە:

یەك: نەهێشتنی کاپیتولاسیون، واتە ئەو ئیمتیازە دەرەکییانەی درابوونە ئەورووپاییەکان. بەشێوەیەکی گشتی ترو لێبراوانەتر، هەلوەشاندنەوەی هەر جۆرە چاوەدێری ئەورووپاییان بەمەبەستی وەدەست هێنانی ئازادی تەواوی کار.

دوو: تورکی کردنی تورکیا، چارەسەرکردنی مەسەلەی نەتەوەکانی نێوخۆ بۆ

هەمیشەو «پاکسازی وڵات» لەنەتەوە مەسیحی‌یەکان.
سێ: لادانی «تەگەرە»ی ئەرمەن لەسەر ڕێگای پان تورانیزم بەهۆی لەنێوبردنی نە بەتەنێ ئەرمەنەکانی ڕۆژئاوای دانیشتووی تورکیا، بەڵکو ئەرمەنەکانی ڕۆژهەڵاتی دانیشتووی ڕووسیاش، ئەگەر لە شەڕدا بەسەر ڕووسیادا سەرکەونو قەفقاز بگرن.
چوار: لەکاتی تێشکانی ڕووسیادا (کە تورکان بە خۆشبینی‌یەوە بەمەسۆگەریان دەزانی‌و هۆی ئەم گەشبینی‌یەشیان بوونی هاوپەیمانێکی بەهێزی وەك ئیمپراتۆری ئەلمانو سەربازانی ئازای تورك بوو) تەقاندنەوەو پارچە پارچەکردنی دێوی ڕووسی کە بەشێوەیەکی کاتی لاواز دەبوو، ئازادکردنی نەتەوە بەرەسەن تورکەکانو وەدی هێنانی یەکێتی‌ی تورانیان.
پێنج: هەرکاتێ ئەم ئامانجانە وەدی هاتن، جێبەجێکردنی قۆناغی دووەمی بەرنامەو ئازادکردنو یەکێتی‌ی نەتەوەو میللەتە موسلمانەکان.
ژمارەیەکی زۆری ڕێبەرانی تورك هەرخۆیان تورکچی‌و تا ڕاددەیەکیش پان تورانیست بون. نەتەوە تورانی‌یەکان کە ئەوان مەبەستی یەك پێگرتنیان هەبوو، موسلمان بوون، لەبەر هەندێ هیچ زیانێك لەسوود وەرگرتن لە یەکێتی‌ی ئیسلام لەتەك تورکچێتی، لەگۆڕێ دانەبوو. لەلایەکی دیکەوە ڕێبەرە ناوبراوەکان فەرامۆشیان نەدەکرد کە وڵاتانی دراوسێ کە میللەتەکانیان موسلمانن ئەمما غەیرە تورکن - وەك ئێرانو ئەفغانستان - ڕەنگە نەخشێکی گرنگ لەڕێرەوی ئایندەی بەرنامەی پان تورانیستەکان بگرنە ئەستۆ. لەبەرهەندێ هەڵەیەکی بێزراوی سیاسی‌یە ئەگەر خۆیان بخەنە ژێر دروشمی تورکچێتی (پاك)ەوە «٢».
لەدوایی‌دا نەدەبوو هێزی بێ برانەوەی مەعنەوی‌و سیاسی جیهانی ئیسلام لەبیر ببردێتەوە، هەڵبەتە تا ئەو دەمەی ئەوانیان لە کۆنترۆڵ دابێ، بەشێك لە پان تورانیستە توندڕەوەکان خەونی پێکهاتنی ئیمپراتۆریەتێکی جیهانی‌ی ئیسلامی‌یان لەدەوری تورکیای گەورەدا، دەبینی؛ ڕێك وەکوو ئەو ئەستێرە گەرۆکانەی بەدەوری ڕۆژدا دەسووڕێنەوە. تورکچی‌یەکان دەیانگوت: «تورانی یەکگرتوو، سەربەخۆ دەبێ چەقی قورسایی جیهانی ئیسلام بێ، عەرەبستان، میسر، مەراکش، جەزائیر، تونس، ئێران، ئەفغانستان، وڵاتانی دیکە (ڕەنگە مەبەستیان هیند بووبێ)، وێرای هەبوونی سەربەخۆیی نێوخۆ لەلایەنی دەرەکی‌یەوە دەبێ یەك بەرە پێك بهێنن. جیهانی ئیسلام دەبێ کۆمەڵەیەکی یەکگرتووی مکووم پێك بهێنێ».
لەبەرهەندێ بوو ، دەوڵەتی عوسمانی لەسەرەتای شەڕی جیهانی‌دا، جیهادی ڕاگەیاند، دەقی ڕاگەیاندنی جیهاد بەم شێوەیە بوو:
«لەنێوبردنی ئەو کافرانەی ئێمە ئازار دەدەن چ بە ئاشکراو چ بەنهێنی، کارێکی خێرە، هەروەك قورئانی پیرۆز دەفەرموێ: (لەهەر شوێنێکدا چاوت بەوانە کەوت کە هاوبەش بۆ خودا پەیدا دەکەن، بیانکوژەو لەشارەکانیان دەریان بکەو، وەك چۆن ئێوەیان لەوڵاتی خۆتان ئاوارەکرد، ئەو فیتنەچێتی‌یەی ئەوان دەیکەن، سەختترو فەسادەکەی لەشەڕ زۆرترەو ئەمەیە سزای کافران»(٣) . هەرکەسێ هەتا یەك کافریش بکوژێ، خودا پاداشتی دەداتەوە، لەبەرهەندێ، هەر موسلمانێك، لەهەر شوێنێکدا دەژی، دەبێ بەرەسمی سوێند

بخوا کە بەلایەنی کەمەوە سێ چوار مەسیحی لەدەورووبەری خۆیدا بکوژێ. چونکە ئەوان دوژمنی خودان. بزانن کە پاداشتی ئێوە لەلایەن خولقێنەری ئاسمانو زەوی دوو چەندانە دەبێ. هەرکەسێ پەیرەوی ئەم دەستوورە بکا لەترسی ڕۆژی حیساب ڕزگاری دەبێو لەبەهەشتدا ژیانێکی نەمری پێ دەبڕێ».

ئەوئومێدە سیاسییانەی تورکەکان بەو ڕاگەیاندنەوە پەیوەستیان کردبوو، قەت وەدی نەدەهاتن. نەخشەی ڕێبەرانی تورکیا لە بانگهێشتی جیهانی ئیسلام بۆ شەر لەگەڵ هاوپەیمانان، بەتەواوی تێك شکا. ئەمما بە مسۆگەری یارمەتی جێبەجێکردنی ئەو تێزە کوشتارە ترسناکەیدا کە تورکچییەکان لەنێو خۆی ولاتەکەیاندا دایاننابوو.

سرنج ڕاکێشترو گرنگتر لەم ڕاگەیاندنی جیهادە، پەخشنامەیەکی دووروودرێژ بوو کە کۆمیتەی ناوەندی حیزبی ئیتیحادو تەرەقی بەبۆنەی ڕاگەیاندنی شەر بۆ هەموو بەشەکانی خۆی ڕەوانەی کردبوو. لەخوارەوە، چەند بەشێکی، کە نرخە مێژووییەکەی ئینکار ناکرێ، دەنووسینەوە. پەخشانامەکە بەم ڕشانە دەست پێ دەکا:

«لەدوو سەدە لەمەوبەرەوە، ولاتانی دامەنی کیشوەری ئەورووپا فراوانبوونەکەیان لەزەوییو لەدەریادا ئاراستەی ولاتانی تورکو موسلمان کردووە، دەولەتانی ناوەڕاستی ئەورووپا کە بەهۆی ئەم ولاتانەوە ئابلوقە دراون، چونکە ناوچەکانیان فراوان نەدەبوو، خەریکی پێشکەوتنی خۆیان بووبوونو بەردەوام چاویان دابووە ئەو بنکانەی کە ئەوانیان دەخستە ژێر گوشارەوە».

«بنکەی گشتی» دوای ئەوەی باروودۆخی سیاسی جیهان بەدووروودرێژی شی دەکاتەوە دەڵێ:

«ئەو دوژمنایەتییە سروشتییەی لەدوو دنیای ئەلمانیو تورکی موسلماندا لەمەر ولاتانی دەریاوانی ئەورووپایی هەستی پێ دەکرا، پێداویستییەکانی یەکێتییەکی مەعنەوی لەنێوانیاندا دابین دەکرد. مۆسکوییە وەفادارەکانی وەسیەتنامەی «دەڵی پیترو» (واتە پتری شێتو مەبەست پتری گەورەیە) جگە لەنێوبردنی تورکان ئامانجێکی دیکەیان نییە، ئینگلستانو فەرانسە کە لە ڕابردوودا بایەخیان بە درێژەپێدانی ژیانی تورکیا دەدا، ئەمڕۆ بە تەگبیر لەگەڵ ئیمپراتوریی ڕووسیا خەریکی ڕاچاندنی پیلانی لەنێوبردنی تورکیان تا دوای ئەوە زۆر بە ڕاحەتی بتوانن تەواوی ولاتە موسلمانەکانی دیکەش قووت بدەن. ئەوان تائێستا هیند، میسر، تونس، جەزائیرو مەراکشو چەند ولاتێکی دیکەیان قووت داوە. بەلام ئایا ئێمە دەتوانین بێکار دانیشینو دەست بەسنگەوە بگرین لە کاتێکدا هاوپەیمانە سروشتییەکانمان دژی ڕووسیا، دوژمنە سوێند خواردوو و هەمیشەییەکەی ئێمە، چۆتە شەرەوە؟ سەرکەوتنی ولاتانی یەکێتی سێلایەنە مسۆگەرنابێ ئەگەر ئێمە هێزەکانی خۆمان تا دەکرێ نەخەینە بەردەستیانو ڕێگا لەڕوودانی کارەساتێکی گەورە نەگرین. نابێ ئەوە لەبیر بکەین کە تەنیا ئامانجی ئێمە لەبەشداری کردن لە شەری جیهانیدا، پاراستنی خۆمان لە لەنێوچوونی زۆر نزیك نییە، ئێمە ئامانجێکی دەستبەجێ دەگرینەبەر: وەدی هاتنی ئامانجە نەتەوەییو نیشتمانییەکان. هەمان ئامانجەکە لەلایەکەوە بەرەو لەنێوبردنی دوژمنی مۆسکۆییو گەیشتن بەو سنوورە سروشتییەی هاونەژادەکانمان دەگرێتەوە، دەبار لەلایەکی دیکەشەوە هەستی ئابینییە کە

ئێمە بۆ ئازادکردنی جیهانی ئیسلام لەکۆتی کافران، دەوروژێنێ».

لەکۆتایی پەخشنامەکەدا هاتبوو:

«ئێستا دەزانین کە چما شەڕ دەکەین، کاتێ دەرکمان بە ئامانجەکانمان کرد، بەجۆش‌و خرۆشەوە دەچینە ناو شەڕەوە. ئێمە لەپێناوی میللەت، دین، و ئامانجی نەتەوەیی خۆمان دەجەنگین».

لەبەرامبەر ئەم جۆرە جۆش‌و خرۆش‌و وروژانی بارەدا، لەبەرامبەر ئیرادەیەکی وادا، دروشمی بێ لایەنی کە لەلایەن ڕێبەرانی ئەرمەنی نێو ئیمپراتۆریی عوسمانی‌یەوە بەرزدەکرایەوە، بێ گومان بێ هودەو نابەجێ بوو،و گچکەترین کاریگەریی نەبوو. هەروەها پەیامەکانیان بەنێوی «نیشتمانی هاوبەش» پێش ڕاگەیاندن، مەحکوم بەشکست بوو. چونکە لەوە بەدوا دانیشتن لە«نیشتمانی هاوبەش»دا لەنەتەوە نێوخۆیی‌یەکان قەدەغە بوو.

شتێك کە بۆ تورکان بەبایەخ بوو «سەرەتای هاوڵاتی عوسمانی» نەبوو کە بێ چەندوچوون بەرهەڵڵایان کردبوو، بەڵکو بازووی چەکداری ئەرمەنەکان بوو. دەبوایە ئەوان بکەنە هاوپەیمانی خۆیان‌و ئەگەر نەشکرا، بیبڕن. زۆر باشتربوو ئەگەر دەیانتوانی ئەرمەنەکان ڕازی بکەن کە بە مەیل‌و ئارەزوورەوە ئامانجەکانی تورکچێتی قبوول بکەن. پاشان بەبێ هیچ سەختی‌و توندوتیژی‌یەك بیانخەنە نێو ئاگری شەڕەوە. وانەبا، هەمیشە لەوانەبوو پەنا ڕەبەر شێوەی تورکی ببەن.

هەڵویستی دەستووریی نوێنەرایەتی تورکیا کە لە ئابی ١٩١٤دا لە هەشتەمین کۆنگرەی (داشناك تسوتیون) لە ئەرزەروم بەشداری کردو پێشنیارە بەنێوبانگەکەی ئەمەبوو: هاوپەیمانێتی عەسکەری دژی روسیا لەبەرامبەر گفتی پێکهێنانی ئەرمەنستانێکی سەربەخۆ لەقەفقاز. بەواتایەکی دی، واتە بەخشینی پارچەیەك لە پێستی هەرس پێش کوشتنی. ئەوان جگە لە پەیام ڕاگەیاندن کارێکی دیکەیان نەبوو، بەڵام هان دانی «هاوولاتیانی وەفادار بە عوسمانی» بەگیان‌و ماڵ لەلایان بەس نەبوو. ئەوان خوازیاری بەشداری چالاکانەی ئەرمەنەکان بوون لەشەردا، بەتایبەتی ئیلتیزامی ڕێبەرە سیاسی‌یەکانی ئەرمەن بۆ وروژاندنی ئەرمەنەکانی قەفقاز دژی تزار، ئەوانی بو ئەم کارە هان دەدا. میللەتی ئەرمەن دەبوایە بەتەواوی لە ئاژاوەگیریی جەنگی‌ی حزبی ئیتیحادو تەرەقی بەشداربێ، وێرای وەئەستۆگرتنی ئامانجەکانیشی، لەروانگەی ڕێبەرانی تورکدا هەر جۆرە وەرامێکی مەرجدار، هەرجۆرە رادەربرینێك جگە لە قبووڵکردنی بێ ئەملاو ئەولا، مانای دژایەتی‌و خیانەت بوو. بەکردەوەش، وەرامی ئەرمەنەکانیان هەروا وەرگرت، ئەم ئیلتیزامەی ئەرمەنەکان نە تەنێ ئەوانی لەتووڕەیی توندی تورکچی‌یەکان نەپاراست، بەڵکوو وای لێ‌کردن، شێوازێکی وەفاداریی ساویلکانەو (بێ‌گومانکردن) بگرنە بەر کە بەمە خۆیان لە هەر جۆرە هۆیەکی بەرگری لەخۆ، بێ بەش دەکرد. کاتێ دەستەی مۆسیقای عەسکەری، میلیشیای ئەرمەنی ئامادەی شەڕی بەرەومەیدانی شەڕ، ڕێنوێنی دەکرد، زەنگی مردنی لاوانی میللەتێك لێ‌درا کەکەوتبووە داوی فەوتێنەری ڕووداوەکان ڕادیاربوو ئەزموونی تاڵی ڕۆژگار ئەم میللەتەی فێر نەکردبوو کە ئاکامی ترسناکی ئەم جۆرە وەفاداری‌یە، بۆئەری [illegible]

هۆیەکی بەرگری کردنو خۆبەدەستەوەدانێکی دەستو پێ بەستراوە بەحوکمی درِندەی تورکان.

*****

هەڵسەنگاندنی تێشکاندنەکانی تورکان لەوەدی هاتنی ئامانجە ستراتیژییەکانیان تا ساڵی ١٩١٧ هەرچییەك بێ، ئەوەی بەڵگە نەویستە؛ ئەمەیە: ئەوان توانیان بەهەراوهۆریایەکی زۆرەوە بەشێکی گەورە لە بەرنامە هەنووکەییەکەیان جێبەجێبکەن. یەکەم، تورکیا پێش چوونە نێو شەرەوە بریاری هەڵوەشانەوەی کاپیتولاسیونی دا. پاشانیش پەیماننامەی پاریس ١٨٥٦ و بەرلین ١٨٧٨ی هەڵوەشاندەوەو هەموو مافو ئیمتیازەکانی میللەتێکی سەربەخۆو هەڵبژاردەی کردە هی خۆی.

لە دووەمین قوناغدا بەسوودوەرگرتن لەوەی تورکان کە لەوپەری دابوو، بەشێوەیەکی ترسناکیش لەلایەن مەزنخوازیی ئەلمانەوە هان دەدرا، دورخستنەوەو کوشتاری بەکۆمەڵی ئەرمەنەکانی جێبەجێکرد، واتە هەمان ئەو کارەی (ضیاء گوك ئالپ) «پاکژکردنەوەی ماڵ»ی پێ دەگوتو ئامانجی سەرەکی تورکچییەکان بوو. هەمان ئازادی کاری تەواوی بێ ئەملاو ئەولای لەنێوبردنی زیاتر لە ملیونێك کەسی بێ گوناه بوو کە رێبەری حزبی ئیتیحادو تەرەقی «مافو ئیمتیازی میللەتێکی سەربەخۆو هەڵبژاردەی ناودەبردو هەتا پێش دەست پێکردنی پاکسازیش، داوای دەکرد. لەمەر هەمان کاربوو کە تەلعەت پاشای وەزیری نێوخۆی حکومەتی ئیتیحادو تەرەقی بەشانازییەکی زۆرەوە گوتی: «بۆ چارەسەرکردنی مەسەلەی ئەرمەنەکان، ئەمن بەسێ مانگان، لەسی ساڵ کاری عەبدولحەمید، زیاترم کرد».

کاتێ لەساڵی ١٩١٧، دەوڵەتەکەی ئەو، پەیماننامەی (بەرلین)«٤»ی هەڵوەشاندەوە کە لەسەرەتادا مەبەستی سەرنج دانە خواستە کەمەکانی ئەرمەنەکان بوو، پەیماننامەکە بەتەواوی فەرامۆش کرابوو: دوا دەستەکانی میللەتێك کە تورکچییەکان مەحکوم بە هەڵبران لەنیشتمانی مێژوویی خۆیان کردبوون، لەبیابانی سوریادا ئاوزینگیان دەدا.

لەم بارەدا، خودایانی شەر روویان لە رێبەرە میلیتاریستەکانی ئیتیحادو تەرەقی وەرگێرا. لەشکری تێشکاوی تورك لەبەرامبەر قزاقەکانی لەشکری روسیاو میلیشیای ئەرمەنی دەستیان بە پاشەکشێ کرد«٥». ویلایەتەکانی رۆژهەلات کە لە ئەرمەنە گێرەشێوێنەکان پاکژکرابونەوە، یەك لەدوای یەك کەوتنە دەست مۆسکۆیی و ئەرمەنەکان. «ئامانجی نەتەوەیی»ی تورکان لەنیوەرێی وەدی هاتندا، رەنگی هەڵبزرکا، بەپێی هەموو بەڵگەو رووداوەکان، کردنەوەی دەروازەکانی توران لەکوشتاری ژنو منداڵی بێ دیفاع، دژوارتربوو.

*****

ساڵی ١٩١٧، شایەدی تیشکانی عەسکەری دوژمنە سویندخواردوو و هەمیشەییەکەی تورکان بوو. هەروەها شۆرشی شوباتیشی لەگەڵدابوو؛ بەواتایەکی دیکە لاوازبوونی روسیا بۆماوەیەکی درێژخایەنو هەتا پارچە پارچەکردنی بۆ هەمیشە.

ئەمە، بو نەتەوە تورانییەکانی نێو ئیمپراتۆریی تزارەکان، هاوارێکی کەیف خۆشیو نوێبوونەوەی ئومێدی رزگاریو یەکگرتن بوو. بەلام رێکخراوە سیاسییەکانیان سوودیان

لەم هەڵە وەرنەگرت، ئەم بێ دەنگیو بەرووکەش فەرامۆش کردنە لەبەرامبەر ئامانجە پان تورانیستەکان، ئەم وەفادارییە - دیسان بەرووکەش - بۆ تزار جگە لەنەبوونی هیچ جۆرە مەیدانێکی مانۆر یان بەدەربرینێکی دی، لاوازیو بێ توانایی ئەوان، هۆیەکی دیکە نەبوو، لەهەمان کاتدا، لەدەرەوە کادیرە سیاسییە بەرپرسەکان بەچالاکیو خۆپیشاندانە بەردەوامەکانیان ڕێی «ئامانج»یان گرتبوو. بەتایبەتی «کۆنگرەی موسلمانانی جودایی خواز» کە لەساڵی ١٩١٦ لە لۆزان پێك هات، پەیامێکی بەئیمزای قازی عەبدولرەشید ئیبراهیم، ئەحمەد ئاقائوغلو، یوسف ئاقچوراو عەلی حسین زادە بۆ سەرۆك ویلسۆن نارد بەنێوی بیستو پێنج ملیۆن موسلمانی رووسیا- تەتەر، باشقیر، قەرقیز، سارت، تاجیك، تورکمەن، چیانشینەکانی قەفقاز - بەناوی «هەستی هاوکاری کە لەنێوانیاندا وەردەرکەوتووە» داوای یارمەتیی لەرای گشتی جیهانی کردو داوای کرد لە «کۆتی زاڵمانەی تزاری» رزگاریان بکەن.

دوای لەبەریەك هەڵوەشانەوەی تزاریزم، جارێکی دیکە کۆنگرەی موسلمانان «٦» بوو کە وەك رابردوو بەگوتارو بریارەکانی خۆی ڕێرەوی گۆڕانکارییەکانی دیاری دەکرد. بە پێی ئەم گوتارو بریارانەی کۆنگرە، قەرقیزو تەتەرەکان خوازیاری گێرانەوەی ئۆتۆنۆمی نەتەوەییو ئایینی خۆیان بوون. لەلایەکی دیکەوە، (جەغتایی)یەکانیش وەك قەرقیزو تەتەرەکان خوازیاری سەربەخۆیی‌یەکی وەك سەربەخۆیی خانەکانی خیوەو بوخارا بوون. لەم بارەدا خەریان یەکگرتنو دروستکردنی جۆرە فیدراسیۆنیکیان لەگەڵ عوسمانییە براکانیان لەبەرنامەدابوو «٧».

کۆنگرەی نەتەوەیی «تورکو تەتەر» کە لە (ئوفا)پێك هات، داوای دامەزراندنی «دەوڵەتێکی فولگا- ئورالی» کرد لەبارێکدا قەرم بە هۆی ئەنجومەنێك کە لە باخچەسەرای پێك هاتبوو، سەربەخۆیی خۆی راگەیاند، لەتورکستان هەر کە هەواڵی شۆرشی شوبات گەیشت، خەڵك، حکومەتی ژەنەراڵ (کوروپاتکین)ی فەرمانڕەوای ناوچەکەیان رووخاندو «کۆمیتەی تورکستان»یان دامەزراند کە ڕێکخراوێکی تێکەڵە بوو و «مەقسودوف»ی پان تورانیستی بەنێوبانگ، بەشداربوو.

لەکۆتایی ١٩١٧دا، دوای خولێکی کورتی سۆفیەت بوونی زۆرەملێ، «کۆمیتەی موسلمانان» کە لە (فەرغانە) دامەزرابوو، ئۆتۆنۆمی تورکستانی راگەیاندو بنکەی ناوەندی حکومەتێکی پێك هێناو لەکانوونی یەکەمدا «کۆنگرەی جووتیاران»ی مۆسکو ئەم حکومەتەی بەرەسمی ناسی.

لەنیسانی ١٩١٧، لەیەکەمین «کۆنگرەی موسلمانانی قەفقاز»دا حزبی موساوات خوازیاری بنیاتنانەوەی ئیمپراتۆری لەسەر بنچینەی کۆنفدراسیۆنو پێکهێنانی ئەنجومەنێکی یاسادانانی ناوەندی بوو کە نوێنەری هەموو موسلمانانی رووسیابێ. ئەمە لەواقیعدا دووبارەبوونەوەی هەمان دروشمە پان تورانیستەکان بوو.

ئەمما جگە لەمە، کۆنگرە ناوچەیی‌یەکان، لەئایاردا «کۆنگرەی موسلمانانی سەرانسەری رووسیا» لەمۆسکۆ پێك هاتو لەزمانی ئەو نوێنەرانەی سەرناسی نەتەوە تورانییەکانی شوێنە جۆربەجۆرەکانی ئیمپراتۆری بوون - فۆلگا، تورکستان، سیبیریا، قەرم، قەفقاز - داوای «ئازادیو یەکێتی»یان کرد.

لەهەمان کاتدا، ئەو درووشمانە بەشێوەی جۆراوجۆر لێك دەدرێنەوە. دوو ڕێرەوی سەرەکی کە بۆ چەسپاندنی درووشمەکانیان خەباتیان دەکرد، بریتی بوون لە «لایەنگیرانی کۆنفیدراسیۆن»و «جودایی خوازان». ڕێبازی یەکەم لایەنگیری پاراستنی پەیوەندی کۆنفدرال لەگەڵ رووسیا بوو. لەنێو تەتەرەکانی سەرێو تورکستان لایەنگیری زۆری هەبوو، لەکاتێکدا باکۆ هەمیشە لایەنگری خەتی جودایی لەرووسیاو دوابەدوای ئەمەش یەکێتی لەگەڵ تورکانی عوسمانی بوو.

لەدووەمینو سێیەمین کۆنگرەی موسلمانان کە لە حوزەیرانو ئابی ١٩١٧ لە باکۆ پێك هات، چەند بڕیارێك لەمەڕ پان تورانیزم دران.

*****

لەکوتایی سالی ١٩١٧دا لەشکری رووس کە ورەی بەردابوو، پەراگەندە بووبوو، بەشەپرێوی لەبەرەی قەفقاز پاشەکشێی کردو ئەو ویلایەتە ئەرمەن نشینانەی پێش سەدەیەك لەئێرانی جودا کردبوونەوە، بەجێی هێشتو خەلکەکەی؛ واتە ئەوانەی لە کوشتارە بەکۆمەلەکەوە رزگاربووبوون، بێ پەنا هێشتەوە. بێجگە لەوە ئەرمەنەکانی قەفقازو گورجییەکانی لەبەرامبەر خەتی فەوتێنەری پێشرەوی هێزەکانی تورك کە نزیك دەهاتە بەرچاو، بەجێ هێشت. لە دواییدا هەلێك بۆ وەدیهێنانی سێیەمینو چوارەمین قۆناغی بەرنامەی تورکچییەکان رەخسابوو: لەنێوچوونی ئەرمەنەکانی قەفقازو ئازادکردنی «ئیردنتای» تورانی.

ئەوەی لەلایان بەبایەخ بوو، ئەمەبوو: قەفقاز بگرنو بەزووترین کات بگەنە ئاسیای ناوەڕاست. «پاکسازی» لێبراوانەی نەتەوەی ئەرمەن کارێکی بەپەلەو سادەنەبوو، ئەگەر قسەی رێبەرانی عەسکەری تورك باوەڕبکەین کە ئیدیعا دەکەن «پڕە لەدلسافی» رەنگە ئەرکێکی سەختو ناخوش بووبێ. بەلام بەهەرحاڵ دەبوایە تا کۆتایی جێبەجێی بکەن کە رێگای تورانی یەکگرتوو و سەربەخۆ ئاوەلابێ. ئەرمەنستان نەدەبوو لەسەر رێگایاندا هەبێ.

لەشکری تورك بەرەوپێش بزووت. لەماوەی دوومانگاندا لەگەڵ بەرگرییەکی نائومێدانەی ئەرمەنەکان کە تەنیا مابوونەوە، ئەناتۆلی رۆژهەلاتی گرتەوە. بە پێی پەیمانی برست ـ لیتوفسك (٣ی ئاداری ١٩١٨) تورکەکان نە تەنیا کۆی ئەو زەوییانەیان گرتەوە کە رووسەکان لەسەرەتای شەڕدا گرتبوویان، بەلکو سەرباریش دەستیان بەسەر ناوچەکانی ئولتیو قارسو ئەردەهان داگرت. بەم شێوەیە سنوورەکانی پێش شەڕ بەقازانجی ئەوان گۆڕان. ئەم هەلە چاوەروان نەکراوە، بەتایبەتی گرتنی قارسو قەلاکەی، رێگای ئەودیوی قەفقاز، دەروازەی تورانی خەونی ئاوەلاکرد کەنەتەوەی تورکو تەتەر بی سەبرانە چاوەروانی بوونو بۆ سەرکەوتنی لەشکری «برا» کە بەرووکەش بۆ هاوکاری لەگەڵ ئەرمەنو گورجییەکان هاتبوون، چالاکییان ئەنجام دەدا.

هەر کە هەوالی داگیرکردنی ئەرزەروم بەدەستی تورکان بلاوبۆوە، موساواتییەکان بەمەبەستی بەدەستەوەگرتنی دەستەلاتو راگەیاندنی سەربەخۆیی «ئازەربایجان» لەدژی سۆفیەتی باکۆ راپەرین. لەلایەکی دیکەوە، ئەوان بەگرتنەبەری شێوازێك کە پێشتر تاقی کرابۆوەو بەکارهێنانی کارمەندانی نێوخۆ دەستیان کرد بە کوشتنی ئەرمەنەکانی باکۆو

گەنجەو ئەو ناوچانەی ئەرمەنیان تێدا کەمایەتی بوو. «٨»

بێجگە لەوەش، موساواتی‌یەکان بەیارمەتی کرێ گرتەکانی حزبی ئیتیحادو تەرەقی عوسمانی کەوتنە ڕێکخستن‌و فێرکردنی تەتەرەکانی قەفقازو، ئەرکی خولقاندنی ئاژەوەو گێرەشێوێنی‌یان لەدواوەی سوپای دوژمن‌دا بەو هێزە تازە پێکهاتووانە دەسپارد، بەم شێوەیە، لەو دەمانەدا ئەرمەنەکان بەتەواوی بەتەنێ مابوونەوەو خۆیان لەهەوڵی بێ پایانی مرۆیی بۆ بەرگری کردن لە «نیشتمانی هاوبەش» لەبەرامبەر لەشکری هێرشکەردا، ماندوو دەکرد، تەتەرەکان کەبەشێوەی ستوونی پێنجەم ڕێك خرابوون، پردو سکەی شەمەندەفەریان دەتەقاندەوەو سەرچاوە ئاوەکانیان کۆر دەکردەوە، ئەو کارانەی بۆ ئیفلیج کردنی هاتووچۆو گەیاندنی هێزەکانی ئەرمەن پێویست بوون.

سەرباری گوتەی ڕێبەرانی تورك‌و تەتەر کە ئیدیعایان دەکرد زۆربەی دانیشتوانی قەفقاز تورکن، هەموان دەیانزانی تەتەرەکان هەتا سێ‌یەکی دانیشتوانی قەفقازنین‌و لەبەر هەندێ بێ ئەم لاو ئەولا کەمایەتین. مەبەستیان بەراوردکردنی واقیعیەت بەگریمانەکان‌و ڕووبەڕووکردنەوەی دنیا لەبەرامبەر کاری ئەنجامدراو بەکاری بەپەلەو توندوتیژی بوو.

لەگەڵ هەموو ئەمانەش‌دا، نەدەکرا بە لێدانێك سەرانسەری قەفقاز بکرێتە خاکی تورکان‌و، گورجی‌و ئەرمەنەکان دەست بەجێ لەنێو ببرێن، نەخەسەلە بەهێزی ئازەرانیش. لەبەرهەندێ مەبەستیان ئەوەبوو ئەم دوو نەتەوەیە یەکەم جار لەیەکدی جودابکەنەوەو پاشان لەکاتی گونجاودا بەجودا لەنێویان ببەن. ئەرمەنستان بەهۆی شوێنە جوگرافی‌یەکەیەوە تەگەرەیەکی هەنووکەیی پێك دێنێ‌و بەهۆی بەرگری‌یە دلێرانەو نائومێدەکەی ترسناکتر بوو، بۆیە دەبوو هەوەڵ جار ئەو لەنێو ببرێ. لەم میانەش‌دا دەبوو گورجستان نەرم بکرێ‌و دلنەوایی بکرێ‌و وەختی لەشکری «براگەورە» واتە عوسمانی دەگاتێ، حیسابیان بۆ بکرێ.

*****

کاتێ لەشکری تورکیا گەیشتە ساری قەمیش‌و باتووم، ئیدی تەتەرەکان پێویستیان بەدیکۆر نەبوو، دەمامکی خۆیان کە زۆر ناسك بوو، دڕاند. لە ٧ی نیساندا وەزیرانی تەتەری «حکومەتی ئەودیوی قەفقاز» ئولتیماتۆمێکیان (تحذیر) داو داویان کرد حکومەتی ناوبراو هەڵوەرجی پەیمانی برێسك - لیتوفسك قبوڵ بکاو لەگەڵ عوسمانی‌یاندا پەیماننامەی ئاشتی مۆربکا، ئەگەرنا لە «سێیم» (ئەنجومەنی دەوڵەتی)ی ئەودیوی قەفقاز دێنەدەرێ‌و سەربەخۆیی ئازەربایجان ڕادەگەیەنن.

تورکەکان دوای گرتنی قارس لە ١١ی نیسان، ئیدی بەو شتانەی ڕووسەکان، دابوویانێ، ڕازی نەدەبوون، لە ١١ی ئایار داوایان کرد، سورمالو، شروور نەخچەوانو هەروەها سکەی شەمەندەفەری ئالکساندروپل - ئەچمیادزین - یەریفان - جلفایان بدرێتێ تا بتوانن هەرچی زووتر بگەنە باکۆ. تورکەکان بەمەبەستی تەواوکردنی فەتحەکانیان، داواکردنی پاشماوەکەیان خستەئەستۆی برا قەفقازی‌یەکانیان: قەرەباغ، زەنگزور، دۆڵی ئەلاگەزو هەتا ناوچەشاری یەریڤانیش. نەدەبوایە هەتا بستێکیش لەخاکی ئەرمەنستان بمێنێتەوە کە بتوانێ «دووبەشی نەتەوەی تورك» لێکدی جودابکاتەوە ، ڕەنگ بوو ئەرمەنەکان بتوانن دێرو کلیسای «ئەچمیادزین» بپارێزنو تیایدا نوێژی مردووان بۆ

ئەرمەنستانو تەواوی ئەرمەنان لەرۆژئاوایی‌و رۆژهەلاتی، بکەن.

زەمینە بۆ دووبارەبوونەوەی رووداوە ترسناکەکانی سالی ١٩١٥ خۆش کرابوو. ئەمما ئەرمەنەکان بڕیاریان دابوو زیندوو بمێنن. دەبوو بە هەر نرخێك بێ سەلامەتی‌و بەردەوامیی ژیانی خۆیان دابین بکەن. ئەو شەڕە گرنگانەی ئەرمەنەکان لە ٢٦ تا ٢٨ی ئایار لەسەردارئاباد، باش ئاباران‌و قەرەکلیسا کردیان، هێرشی پان تورانیستەکانیان تێك شکاندو ناچاریان کردن کە مافی ژیان‌و سەربەخۆیی ئەرمەنستان لەچوارچێوەی پەیمانی باتووم (٤ی حوزەیرانی ١٩١٨) بەرەسمی بناسن.

بەلگەنەویستە کە تورکەکان وازیان لەبەرنامەی خۆیان نەهێنابوو، بەپێچەوانەوە بۆ گەیشتنە لێوارەکانی دەریای خەزەرو ناوچەکانی ئەودیوی خەزەر ئەوەندەیان پەلەبوو، هەتا گوێیان لەئەلمانی هاوپەیمانیشیان نەگرت. لەشکری تورك بۆئەوەی کاتە بەنرخەکەی لەشەڕو پێکدادانی ئەرمەنان لە دەست نەدا «چارەسەری کۆتایی» ئەم مەسەلەیەی (کە مسۆگەر بووبوو لەوە دژوارترە کە پێشبینی‌یان کردبوو) وەدواخست‌و بەسادەیی بەدەوری لەمپەری ئەرمەنستاندا سووڕانەوە. ژەنەرال نوری پاشا لەکۆتایی حوزەیراندا گەیشتە ئەلیزابت پول (گەنجە)و کەوتە ئامادەکردنی سوپایەك لە تورك‌و تەتەر بۆ هێرش کردنە سەر باکۆ.

لەم نێوانەدا، حزبی موساوات، لەباتووم کە لە ٢٦ی ئایار بەدەستی تورکان گیرابوو، «سەربەخۆیی ئازەربایجان»ی راگەیاندو بەشێوەیەکی کاتی (گەنجە)یان کردە پایتەختی خۆیان، لەگەنجە حکومەت‌و خەلك رەسمی‌یانە پێشوازیی نوری پاشایان کرد. ئەمەی خوارەوە بەشێکە لە گوتاری (خان خوئینسکی)ی سەرۆك حکومەت کە لەبەخێرهێنانی فەرماندەی تورکدا بەئامادەبوونی خەلکێکی زۆر لە مزگەوتی (گەنجە)دا خوێندیەوە:

«سەرەنجام میللەتی تورکی ئازەربایجان وەدی هاتنی هێژاترین ئامانجەکانی خۆی دەبینێ: ئازەربایجان دەچێتە دامەنی خەلافەتی عوسمانی. سەرەنجام ئارەزووی لەمێژینەی موسلمانان بۆ یەکپارچەیی وەدی دێ: یەکێتی لەژێر ئالای کەسکی سولتاندا چیانشینەکانی قەفقاز، تەتەرو قەرقیزەکانی تەتەرستان، سارتەکانی ئەودیوی خەزەر، خەلکی خیوەو بوخاراو لەدواییدا ئەفغانستان‌و هیندی دەولەمەند، بێ سەبرانە چاوەروانی لەشکری رزگاریخوازی عوسمانین. بژی لەشکری عوسمان، بژی ئیسلامی جیهانی‌و یەکگرتوو».

بەشێك لەهەلەکانی گۆکردنی خان خوئینسکی پێویستی بەراستکردنەوە هەیە. یەکەم؛ ئەو قسە لەخەلافەتی عوسمانی دەکا، لە کاتێکدا هەر موسلمانێك دەزانێ خەلافەتی ئیسلامی هەیە نە خەلافەتی عوسمان. دووەم؛ ئالای سولتان عوسمانی سوربوو، رەنگی کەسك تایبەت بوو بە «سنجاقی شەریف» (ئالای پێغەمبەری ئسلام). سێیەم؛ لەناوهێنانی ئێران، بلوجستان‌و هەتا عەرەبستان کە لانکەو بنکەی ئیسلامە، خۆ دەبوێرێ‌و لەکۆی ولاتانی موسلمانی عەرەبی واتە ناوی میسرو تەرابلووس‌و تونس‌و جەزائیرو مەراکشیش ناهێنێ. هەلەو غەفلەتەکانی ئەم گوتارە کەمەبەستی ناوهێنانی نەتەوە موسلمانە تورانی‌یەکانە، پاساو نادرێن، چونکە «خەلکی هیندی دەولەمەند»یش

دەگریتەوە، بەرووکەش ئەوەندەی ئینگلیزەکان، لەلای پان تورانیستەکانیش سرنج راکێشە، چونکە ئەوان لەکۆنەوە ئاشقی بوون، بەلاَم نابێ ئەوە فەرامۆش بکرێ، کە ئەم گوتارە لەلایەن پان تورانیستێکەوە دراوە کە تازە بە ئامانجەوە پەیوەست بووە.

دوای یەکەمین بەرگری توندی ئەرمەنەکانی دەشتی ئارارات لەبەرامبەر تورکان لەسەرتای هەلَفرینیاندا بەرەو توران، تورکەکان لەدووەمین هەنگاوی خۆیان لەبەرامبەر باکۆدا رووبەرووی بەرەنگاری تازەی ئەرمەنەکان بوونەوە کە وەك جاری پێشوو توندو سەرسەختانە بوو. ئەنگیزەی شەڕی ئەرمەنەکانی باکۆ پێویستیی پاراستنی گیانی ژمارەیەکی کۆمەلَی دانیشتووانی ئەوێ بوو. ئەگەر ئەزموونی تالَی مێژوو، ئەرمەنەکانی باکۆی فێر نەکردبا کە چ شتێك چاوەروانیانە (بەسرنج دانە شێوەی تورکان) ئەوان هیچ مەیلێکی نەتەوەیی‌یان بۆ پاراستنی ئەم شارە تورك نشینە نەدەبوو و رێگای داگیرکردنی شارەکەیان لە ئازەرەکان نەدەگرت.

ترسیان بێ بنچینە نەبوو. وەختێ لە ١٥ی ئەیلوولدا، خەلیل پاشاو نوری پاشا دوای چەند هەفتە شەڕی نێو سەنگەرو لەدوایی‌دا تەن بەتەن شاریان داگیرکرد تا حکومەتی موساواتی‌یەکان بەسەرۆکایەتی خان خۆئینسکی لەگەنجەوە بگوازنەوە ئەوێ. هێزەکانیان بەیارمەتی تەتەرەکانی ئەوێ لەماوەی چوار رۆژاندا، کەوتنە رەشەکوژی ئەرمەنە بێ دیفاعەکان. بیست تا بیست و پێنج هەزار کەس کوژران و نزیکەی دە هەزار کەسی دیکە دوای ئەوەی بەشێوەی نوێی پێرەوانی حزبی ئیتیحادو تەرەقی بۆ دەشتی موغان راگوێزران، مردن.

ئەم جارەیان تورەیی‌یەکەیان لەدژی ئەرمەنان ماناداربوو. جەنگاوەرانی ئەرمەنی، یەك مانگ پان تورانیستەکانیان لەبەرامبەر باکۆدا راگرت و ناچاریانکردبوون، هێزەکیانیان لەوێ لێك هەلَوەشێنن و بەم شێوەیە ئەوکاتە بەنرخەی دەبوایە بۆ گرتنی توران خەرجی بکەن، بەفیرۆ بدەن.

*****

دوای گرتنی باکۆ، تورکان بەرەو باکوور، واتە داغستان رۆیشتن، بالَێکی دیکەی لەشکری تورك، لەخوارێ ڕا بەرەو ئاسیای ناوەڕاست، لەچەند بەشێکی باکووری ئێرانەوە چووە پێش و ناوچەکانی تەوریز، ئەردەبیل و گەیلانی گرت و لەوێ «راپەرین»ێکی دروست کرد. لەروانگەی پان تورانیستاندا ئازەربایجانی ئێران (تەنیا ناوچەیەك کە ناوی ئازەربایجان لەگەلّ واقیعە مێژوویی‌یەکەی‌دا دەگونجێ، بە پێچەوانەوی ئازەربایجانی قەفقاز کە لەڕووی مێژوویی‌یەوە، دروستکراوە) وەك قەفقاز تەنیا رێگایەکی تێپەربوون بەرەو تورکستان نەبوو، بەلَکو بەشێکی تەواوکەری توران پێك دێنێ، سەرزەوی‌یەك کە خەلَکەکەی لەنەژادی تورکمان و خورەکانی ئوغوزی بوون و لکاندنی، لەبەرنامەی هەنووکەیی «ئوغوزیزم»دا تۆمارکرابوو.

لەئاسیای ناوەڕاستدا، لاوانی ناسیونالیستی تورکستان ـ سارتەکان «٩»و ئۆزبەکەکان ـ بێکار دانەنیشتبوون. دوای کودێتای بەلَشەفیکەکان لە پترۆگراد ـ کە بەشۆرشی ئۆکتۆبەر ناسراوە ـ سەربازانی لەشکری سۆر تورکستانیان گرت و گفتی سەربەخۆیی‌یان بە خەلَکەکەی داو «سوفناکوم»ێکی نێوخۆیی‌یان پێك هێنابوو کە حەفت

رووسی‌و تەنیا دوو تورکی تێدا ئەندام بوون، لەبارێکدا زۆربەی زۆری لەسەدا (٩٥ %) تورك بوو، واتە ئۆزبەك، تورکمەن، قەرقیز، قەرەقالپاقەکانو ئەوانی دی. لەمانگی یازدە، تورکستان وێرای داواکاری ئۆتۆنۆمی، دەستی بە راپەرین کردو دەوڵەتێکی سەربەخۆی پێك هێنا. بەلشەفیکەکان کە سەرگەرمی مەسەلەکانیان لەبەرەی رۆژئاوادابوون، بەشێوەیەکی کاتی خۆیان لەسەرکوت کردنی «شۆرشی چەواشە»ی تورکستان، بەدوورگرت.

ئەمما لەشوباتی ١٩١٨، سەربازانی سوفیەتی بۆ گرتنی قەڵای پان تورانیزم نێردرانو لەتورکستان رووبەرووی بەرگرییەکی توندبوونەوە کە بەسەرکەوتنێکی توندو لەنێوبردنی زیاتر لە ملیونێك کەس بەهۆی قاتوقڕی، باروودۆخیان کۆنترۆڵ کرد«١٠». دوای هەندێ، بەپێی شێوازێك کە بەلشەفیکەکان چەندان جار گرتبوویانە بەر، نۆرەی سیاسەتی ئاشتی گەیشت. لەم ناوچە تورك نشینانەی کە «سوفیەتی کرابۆوە»، رۆپاگندەو خەبات لە پێناوی «پەروەردەی ئایدیۆلۆژی» جێگای رەفتارە کرێتەکانی لەشکری سۆرو چکا (پۆلیسی نهێنی سوفیەتی)ی گرتەوە. لەلایەن رووسەکانەوە گوتار گەلێك دەربارەی لێکچوونی کۆمۆنیزمو ئیسلامو هاوئامانج بوونیان دران. پەیامەکانیان بۆ «برایانی موسلمان» هان دان بوو «بۆ رزگاربوون لەمردن یەکبگرن». یان «لەگەل پرولیتاریای رووس کە ئەوان لەکۆتی ئیمپریالیزم رزگاردەکا، یەك بگرن!».

ستراتیژی بەلشەفیکەکان دوو ئامانجی هەبوو: یەکەم؛ مەبەستی بوو، سرنجو دوژمنایەتی نەتەوە تورانییەکان لەدژی رووس ئاراستەی جێگایەکی دیکە بکاو دووەم؛ خەباتە نەتەوەیی‌و ئایینییەکانیان بە لاڕێ دابباو بەشێوەیەك مۆڵەت بدا یەکێتی وڵات بپارێزرێ یان بەلایەنی کەمەوە پارچە پارچەبوونی کە لێی دەترسان، وەدوابکەوێ.

بەم شێوەیە ستراتیژی بەلشەفیکەکان دەیویست تەواوی نەتەوەکانی تورکو تەتەر لەوانە کەسایەتییە ئایینی‌و پاریزکارەکان بەرەو لای خۆی راکێشێ تا پاشان بتوانێ دەمارگرژی موسلمانان لەدژی شۆفینیزمی پان تورانیستەکان وەرگێرێ. لەقۆناغی دووەمدا، ئامانجی ئەم سیاسەتە سوود وەرگرتن لە پان تورانیزم دژی ئینگلستانی رەقیبی سەرەکی رووسەکان لە رۆژهەلات، بوو.

لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا، نەسەرکوتەکانی لەشکری سۆر بۆ ئارام کردنەوەی تورکستان بەس بوو، نە پروپاگندەش کە دوابەدوای هەندێ دەکرا. شەڕی نهێنی‌و توندی نێوان رووس‌و نەتەوەکانی ئۆزبەکو سارت کە دەستەی پارتیزانییان دروست کردبوو، وازیان لەداواکردنی سەربەخۆیی بۆ تورکستان نەدێنا، لەسەنگەرێکەوە کە زیاتر لەپان تورانیزم نزیك بوو، بەردەوام بوو. بەتایبەتی پارتیزانەکانی بزووتنەوەی «باسماچی» تێ دەکۆشان باوەڕی خویان لەمەڕ رزگارییان بەدەستی «براگەورە»ی عوسمانی، بپارێزن، خەونێك کە دوای چەند ساڵێك ئەنوەرپاشا ویستی وەدی بهێنێ، بەلام سەرنەکەوت.

لە ٣٠ی ئۆکتۆبەری ١٩١٨ تورکیای عوسمانی پەیماننامەی شەڕ راگرتنی (مودروس)ی لەگەڵ هاوپەیمانانەدا مورکردو بە پێی ئەو رێکەوتننامەیە تورکیا ناچارکرا قەفقازو ئێران چۆڵ بکاو بگەرێتەوە سنوورەکانی پێش دەست پێکردنی شەڕ، ئەم تێشکانە، تورکەکانی بۆ دەمێك لە پەلو پۆ خستو ناچار بە پاشەکشێ کردو لێ بڕان

شێوەی تورکی درووشمی «چوون بەرەو ڕۆژهەڵات»ی ئەڵمانەکان، وەلانێن.

(١) ئیمپراتوریی عوسمانی لەرووبەرووبوونەوەی دنیای ڕۆژئاوادا چەند جارێك ریفۆرمی بەرێوەبەرایەتیو ئابووریو عەسکەری خۆی دەست پێ کرد، بەلاّم لەدوا قۆناغەکانی کارەکەدا، بەشێوەیەکی بەرچاو لایەنی «نێودەوڵەتی»و خۆ تێ‌گەیاندنو سەپاندنی روانگەی هێزە گەورە جیهانی‌یەکانی لەکاروباری عوسمانی بەسەردا زاڵ بوو.

دوا هەوڵ کە لەم زەمینەیەدا ئەنجام درا، زنجیرە گفتوگۆیەك بوو لەساڵی ١٩١٣ بەناوی ریفۆرمی ئیداری لە ویلایەتەکانی ڕۆژهەلاّتی عوسمانی لەنێوان بالوێزەکانی رووسیاو ئینگلیزو فەرانسەو ئەڵمانو ئەمسار لێپرسراوانی عوسمانی لە ئەستەمبۆل ئەنجام درا، لەم گفتوگۆیانەدا، بڕیاردرا ئەم ویلایەتانە لەژێر چاوەدێری لێپرسراوە ئەوروپایی‌یەکاندا بەرێوەبچن، بەلاّم جێ‌بەجێ‌کردنی ئەم تێزە بەهۆی دەست پێ‌کردنی شەری جیهانی هەرگیز جێ‌بەجێ نەکرا.

(٢) لەم بوارەدا بەتایبەتی لەسعراتیژی عەسکەری پان تورانیسەکان، بەتێزەکانی ئەنوەرو خەلیل پاشا ناکۆك بوون: ئەنوەر پاشا ئەودەمی بۆ راکێشانی نەتەوە موسلمانەکان بۆ ئامانجەکانی پان تورانیزم بەگونجاو دەزانیو لاریی لەدانی هەندێ ئیمعیازیش نەبوو، و هەندێ ئیمعیازیشیان نەبوو تا بەهۆیەوە ببنە هۆکارێکی فراوانخوازی تورکان. خەلیل پاشا موسلمانی غەیرە تورکی بەگشتی بێ راسعگۆیی پان بەلایەنی کەمەوە بێ متمانە دەزانی. بەتایبەتی کەسانێك کە بە «بەرازانی عەرەب»ی ناودەبردن. ئەو دەیویست قەفقاز داگیربکا، ئەرمەنو گورجی‌یەکان لەنێو ببا بێ درەنگ بەرەو ئاسیای ناوەراست «لانکەی نەژادیان» بچن. لەوێوە دەبوایە تورکیای گەورە بەرەو باکوورو ڕۆژئاوا فراوان بکرێو هەموو نەتەوە تورکەکان کە هێشتا ئازاد نەبوونە، بگرێتەوە.

(٣) سوورەتی (بەقەرە) ئایەتی ١٨٨ (لەراسعی‌دا ئایەتی ١٩١) و.کوردی

(٤) پەیماننامەیەك لەساڵی ١٨٧٨ لەلایەن ولاّتانی ئەوروپایی بەسەر تورکیای عوسمانی‌دا سەپێنراو ئەنجامی ریفۆرمی لە ویلایەتەکانی ڕۆژهەلاّت پێشبینی کردو زۆربە بوونی ئەرمەنی لەوان ویلایەتاندا بەرەسمی ناسی

(٥) ئەو میلیشیا میللی‌یەی لەلایەن حزبی (داشناك تسوتیون) دروست کرابوو، لەگەڵ لەشکری رووسیادا بۆ ئازادی ویلایەتە ئەرمەن نشینەکانی عوسمانیو رزگارکردنی پاشماوەکانی کوشتاری بەکۆمەڵی ئەرمەنەکان، کاری دەکرد.

(٦) نەتەوە تورانی‌یەکانی روسیا «موسلمان»و زمانیان بە «موسلمان جا» **Muslumanja** ناودەبرێ، بەلاّم ئەم بابەتە نابێ ببێتە هۆی ئەو هەڵەیە کە لەهەر جێگایەکدا قسە لەپان تورانیزم بکرێ، گفتوگۆش لەمەر «نەژادی موسلمان»و «یەکێتی موسلمانان» بکەین. هەڵبەتە، هەروەك چۆن هیچ جۆرە زمانێکی هاوبەشی ئیسلامی لە کایەدا نی‌یە، هیچ «نەژادی ئیسلامی»یش نی‌یە، بەڵکو تەنیا نەژادی تورانی هەیە کە بەزاری جۆراوجۆرو گرووپی نەتەوەیی کە بەو زارانە دەدوێن. لەگەڵ ئەوەدا، زۆربەی ئەم کۆمەلاّنە پێرەوی ئاینی ئیسلامنو هاوبەشی ئاینی مەیلیان بەیەکگرتن کە هەمیشە لەنێویاندا هەبووە، بەهودەکا بەهیچ شێوەیەك خەسڵەتی نەژادی ئەم ئاکامە ناگۆرێ.

(٧) CF. ~LIslam et la Politiquie des Allies~.
Enrico Ensabato. 1920, P.220

(٨) ئازەرەکان لە ناوچەکانی شمکورو نوخاو ئەرشو هەندی شوێنی دیکە چەند هەزار رووسی‌یەکیان

رەشەکوژ کرد کە زۆربەیان ئەو پەناهەندەو سەربازانە بوون کە لەبەرەی شەڕ دەگەڕانەوە.

(٩) بە خەڵکانی (جێگیرو شارنشین)ی ئاسیای ناوەراست دەگوترێ کە بەرەسەن ئێرانی بوونو لەنەتەوە کوچەرو تورك زمانی ناوچەکە، جودان (و.ف).

(١٠) ئەم ئابلوقەیەی بەلشەفیکەکان بەسەر ناوچەی (فەرغانە)یان داسەپاند، بریتی بوو لەرێگا گرتن لەهێنانی دانەوێڵە لە «ئاق تیوبینسك» کە کۆگای دانەوێڵەی ناوچەکەبوو، بەو هۆیەوە هەشت سەت هەزار کەسو ژمارەیەکی زۆری مەڕومالاَت، گیانیان لەدەستدا.



# دوای شەڕ راوەستان

دوای ئەوەی تورکیای عوسمانی بەگرتنی باکۆو یەکەمین بزووتن بەرەو تورکستان لە ئامانجەکانی نزیك بووبۆوە، لەناکاو کەوتە ریزی دەوڵەتانی تێشکاوو ناچاربوو واز لەفەتحە بەنرخەکانی لەقەفقازو ئێران بهێنێو پاشەکشێ بکا. سەرباری هەندێ، گەلێ وڵاتی ژێردەستە (سوریاو میزۆپۆتامیا) جوودابوونەوەو هەتا ناوچەی وەك ئاستانەو ئەزمیر لەدڵی ئیمپراتۆریەدا لەلایەن بێگانانەوە داگیرکران.

لەم زنجیرە جوودابوونەوانەدا، ئەوەی لەهەمووان گرنگتر دەهاتە بەرچاوو بەڵێدانی گورچك بڕی تورکیا دەژمێردرا، جودایی ویلایەتەکانی رۆژهەڵاتی، نە ئەنجامی دامەزرانی ئەرمەنستانێکی یەکگرتوو، بوو. بەرەنگاریی سەرسەختانەی ئەرمەنەکان لەئایاری ١٩١٨ لە سەردارئاباد تورکیای لە جێبەجێکردنی بەرنامەی لەنێوبردنی ئەرمەنەکان، راگرتبوو. لەبەر کەم ماوەیی و گوشاری رووداوەکان بەردەوامیی ژیانی کۆمارێکی ئەرمەنستانی لاوازو گچکەی لەم دەربەندەدا کە بۆ ئەو مایەی ژیان بوو، بەرگەگرتبوو. بوونی لەمپەرێکی وا لەنێوان ناوکی نەتەوەیی تورکی - تورکیاو دوو ئازەربایجان - بوونی نەتەوەیەکی غەیرە تورك کە بە شێوەی دەوڵەتێکی سەربەخۆ رێك خرابوو، بێگومان لەروانگەی ئەواندا قبووڵ نەدەکراو بەشتێکی کاتییان دادەنا. لەبەرهەندێ هەتا یەك دەم لەدامەزرانی ئەرمەنستانی گەورە بەشێوەی لەمپەرێکی لەگێران نەهاتوو لەئارەزوو و ئامانجەکانیاندا، رازی نەبوونو دانیان پێدانەنا.

پاراستنی ئەناتۆلی رۆژهەڵاتو رۆژئاوا، دابینکردنی تەواوی خاکو سەربەخۆیی یەکەی، راوەستان لەسەنگەری نەتەوەیەکی تورانی خاوەن دەستەڵات، تەوەری راکێشانو یەکبوونی نەتەوە براکان، چەند پێویستییەك بوون، ئێستا تورکیا وەك یەکەمین خاڵی ستراتیژییە نوێکەی لەبەرچاوی دەگرتن.

وەدی هێنانی ئەم کارە دەکەوتە ئەستۆی چ کەسانێك؟

کاری حکومەتی سێ سوورچی ئەنوەرو تەلعەتو جەمال تەواوبووبوو، ئەم سێ رێبەرە سیاسییە لەمەیدان وەدەرکەوتبوون، واتە لەکەنارەکانی بوسفۆرو گۆرەپانی کارە خوێناوییەکانیان هەڵاتبوون. حزبی ئیتیحادو تەرەقی لەبەریەك هەڵوەشابوو.

ئەمما نەوەیەکی تازە لەسایەی بزاڤی تورکچێتیدا پەیدا دەبوو کە عەسکەریو رۆشنبیرانی دەگرتەخۆو ئامادەیی جێگرتنەوەی هەبوو. نەوەیەك تەواو باوەڕی بەئامانجەکانی تورکچێتی هەبوو. لایەنگرێکی دەمارگرژو ئاشتی نەخوازی ستراتیژێکی نەتەوەیی تورك، نەوەیەکی زۆر واقیع بین، نیشتمانپەروەرە

خوبەستنەوە بە ئەڵمانیای تێشکاو کارێکی بێ هوودەبوو. ئەودەم تورکچییەکان هەرگیز ستراتیژی یەك لایەنەو کوێرانەی ئەنوەرو تەلعەتیان قبووڵ نەکردبوو کە سەرەنجام وڵاتەکەیان کردە پاشکۆو پاشکەوتووی دەوڵەتە ناوەندییەکانی ئەورووپا. بەتایبەتی لەو

نارازی بوونە ڕۆژ بەڕۆژ زۆرترەی دەوڵەتی ئەڵمانیا خۆش نەدەبوون کە لەسەر نەخشەکانی تورکان لەکاتی جێبەجێ‌کردنیدا، دەریان بڕیبوو، لەبارێکدا، یەکەم جار هانیان دابوون.

دەتوانرێ بگوترێ لەدووەمین ڕۆژی شەڕ راوەستاندا، دەزگای ڕێبەرایەتی تورکیا بەرازی بوونەوە ئاگای لە دەرکردنی ئەم دەوڵەتە هاوپەیمانو ڕەقیبەی پان تورانیزم لەگۆرەپانی سیاسی ئاسیابوو. هاوپەیمانێك کە نەخشەی فەتحە عەسکەرییەکانی لەبەرلین دەستی پێ دەکردو دەگەیشتە بوخارا. لەم کاتەدا، لەئاسۆی سیاسی تورکیادا یەکەمین پریشکی ئومێد وەدەرکەوت. هەروەك، ئەو ڕێبازە نوێیەی بەلشەفیکەکان لەسیاسەتی دەرەوەی ڕووسیا گرتبوویانە بەرو پاشان رای جودای دەوڵەتە رۆژئاواییەکان.

ڕووسیای هاوپەیمانی ئینگلستانو دوژمنی دێرینی تورکیا دەبۆوە هاوپەیمانێکی بەهێز، هارکات بەئاشکرا دژایەتی گەورەترین هێزی دەریایی دنیای دەکرد. لەبەرامبەر ئەمەدا، <u>شمشێری دیموکلیسی</u> نەك هەر بەشێوەیەکی کاتی لەسەر تورکیا دوور دەکەوتەوە، بەڵکوو هارکارییەکی پتەویش، جێگای دەگرتەوە، ئینگلستانی سەرکەوتوو کە لەپشتیوانەوە دەبووە دوژمن داوای نەکراوی لەتورکیا دەکرد. ئەمما ئەم داواکارییانە، ئەوەندەش ترسناك نەدەهاتنە بەرچاو، چونکە لەبەرامبەر «<u>پیاوە نەخۆشەکەدا</u>» کە خورلی چاك بوونەوەی بەسەردەبرد، لاتەریك بووبوو، و تورکیا دەیتوانی نەك هەر بەتەنێ پشت بەئەڵمانو ڕووسیا ببەستێ، بەڵکوو حیسابێکیش بو فەرانسەو ئیتالیای هاوپەیمانی ئینگلستان بکا. ئەودەم، ئینگلستان هەرچەندی گەورەیی نیشان دابایە نە نێوبانگێکی لەشکان نەهاتووی هەبوو، نە بێ تەماحیشە. هەلومەرجی شەڕ راوەستانی <u>مودرووس</u>و بەتایبەتی ئەو پەلە پەلییەی کە بو مۆرکردنی ئەم پەیماننامەیە لەگەڵ دوژمنی تێ‌شکاودا دەکرا بەبێ ئاگاداری هاوپەیمانەکانی دی، بووبووە هۆی ئەوەی گونجاندنی ماددەیەکی گرنگی تێدا «فەرامۆش» بکەن: چەك داماڵینی تورکیا، ئەمەش خۆی بەڵگەیەك بوو کە ئینگلستانی بەرزەفڕو سەرکەوتوو ئامادەیە لەگەمەی پێشبڕکێ لەگەڵ ڕووسیاو هاوپەیمانەکانی خۆیدا، یارمەتی تورکیا بدا. سەرباری ئەمانەش، تورکەکان دەیانتوانی بۆ گوشارخستنە سەر ئینگلستان بەرەستایی بیروڕای موسڵمانانی دنیا لەدژیدا بوروژێنن.

لەدواییدا تورکیا دەیتوانی حیسابێك بۆ پشتگیری نەتەوە تورانییەکان بکا کە لە ئەستەپەکانی ئاسیای ناوەراستەوە بەچاوی نائومێدیو بێبەشی لەبرا گەورەی عوسمانییان دەڕوانیو چاوەڕوانی گەیشتنی دەمی یەکێتی بوون. ئەو دەمە تێپەڕیبوو کە (<u>فەرید بەگ</u>) دەیتوانی بڵێ: «پان تورانیزم ئایندەیەکی درەوشاوەیە، بەڵام ئێستا نییە ئەو شتەی نیشەر ناتوانرێ سوودی لێ وەربگیرێ». دوارۆژێ کەلەسەرەتای سەدەوە لەدوورڕا دەبینرا، ئێستا لەبەردەستانەو ئەوشتەی هەندێ کەس ئیدیعایان دەکرد نییە، خەریکی گەشانەوەبوو. ڕووسیای سوفیەتیش وەك دەوڵەتانی دیکە نەیدەتوانی ئەم هۆکارە نوێیەی دەهاتە مەیدانی سیاسیو عەسکەری نێودەوڵەتانەوە، لەبەرچاو نەگرێ.

تورکەکان دوای ئەوەی ئەم هەلو مەرجە گونجاوو نەگونجاوانەیان هەڵسەنگاندو خۆشیان هەمیشە ئامادەبوون سوود لەهۆکاری گونجاو وەربگرن، بڕیاریاندا تەنیا متمانە بەخۆیانو بەبرا هاونەژادەکانیان بکەن. بۆیە جارێکی دیکە، تەدەوری ستراتیژی نەتەوایەتی

خۆیان لەرۆژئاواوە بۆ رۆژهەلاتر لە ئاستانەوە بو ئەناتۆلی گواستەوەو لەهەناوی ئەناتۆلی رۆژهەلات بوو کە بزافی «نەتەوەیی» لەدایك‌بوو.

ئەوەی نوێی سیاسی دوای رێوشوێنی «یەکێتی نەتەوە تورانی‌یەکان» کە پێشتر رازی لێ هێنرابوو، ئێستا ناوەکەی واتە «یەکێتی» وەلادەناو بە راگەیاندنی ناسنامەی خۆی، حزبی ناسیونالیستی «نەتەوەیی» دروست کرد، کە رێکخراوێکی سیاسی ـ عەسکەری بوو، مگێزی لە پێشینانیان کەمتر نەبوو. بزافی «نەتەوەیی» جگە لەرێکخستنەوەی بیرووراکانی حزبی ئیتیحادو تەرەقی بەشێوەیەکی نوێ لەمەیدانی سیاسی‌دا، شتێکی دیکە نەبوو: دەست‌پێکردنەوەی توندترین مەیلی شوفێنیستی لەحزبێکی سیاسی‌دا بەدرووشمو بەرنامەی نوێ. لەبەر هەندێ لەباتی ئەوەی هەموو شتێك دابهێنێتەوە، بووە میراتگرو فۆتۆکۆپی حزبی پێشوو. ئەم بزافە، تورکچێتی‌یەکی فراوانترو بنچینەیی‌تربوو، خۆی لە عوسمانیگەریی نەخۆش‌و نادیارو یەکێتی‌ی ئیسلامی ئەنجام نەدراوو ئاژاوەگێرانە، جودا دەکردەوە، هیچ چاوەروانییەکی لەنەتەوە نێوخۆیی‌یەکان چ (پاشکۆ)و چ «هاوپەیمان»ی ئیمپراتۆری، نەبوو، رزگاری خۆی لەهیچ شتێکدا نەدەبینی جگە لەهێزی بەتەواوی تورك. بزافێك بوو، بێ دوودلی ئاقاری سیاسی، بەلای نەتەوە گچکەکانو ئامادەبوو بەردەوام بەرێگای گەیشتنە ئامانجدا (هەتا بکرابا هاوکات) لەگەڵ هەمووانیدا هاوکاری یان شەڕ بکار بەهەر هۆیەکی گونجاو هەتا فیداکردنی بەهاکان ـ لەوانە ئایین‌و رێو شوێنی رۆشنبیری.

لەجێگای ئەلمان پەرستی‌ی حزبی ئیتیحادو تەرەقی، ئۆپۆرتۆنیستی‌ی «نەتەوەیی» ئەم شێوە باوەی دیپلوماسی تورکیا، ئەم رۆلە پاکە بلیمەتەی سیاسی تورك لەزۆر کۆنەوە، دادەنیشت. بزووتنەوەی نەتەوەیی تورکیا ئەوەندە بەنێوبانگە، پێویست نی‌یە لێرەدا کورتە مێژوویەکی باس بکەین. مستەفا کەمال‌و کارەکانی تا ئەو جێگایەی پەیوەندی بە لێکۆلینەوەکەی ئێمەوە هەیە، لەهەمان سەرچاوەی تورکچێتی دەخۆنەوە. لەبەرهەندێ تەنیا لەو چەند رووداوو مێژووە دەدوێین کە یارمەتی تێگەیشتنی مەسەلە بنچینەیی‌یەکان دەدەن.

ئامانجی بزافی «نەتەوەیی» رەدی هێنانی ئارەزووی تورکان لەدژایەتی بەرنامە دابەش کردنی تورکیا لەنێو هاوپەیمانان بوو، بەلام بەتایبەتی دژی دامەزرانی ئەرمەنستانی سەربەخۆ ئاراستە دەکرا کە بەدیوارێکی مکوومو لەگێران نەهاتووی نێوان تورکیاو «لانکەی مێژویی نەژادی تورك» دەژمێردرا.

لەبەهاری ١٩١٩دا، ئەگەر بزافی «نەتەوەیی» لەئەناتولی رۆژهەلات دەستی پێ کرد، رێبەرانیان رایانگەیاند کە ئامادەن تا گیان فیداکردن لەرێگای جێگیرکردنی دەولەتێکی نەتەوایەتی لە خاکەکەیاندا، خەبات بکەن. ئامانجی «مودافەعەی میللی» کە بۆ هەما مەبەست پێك هاتبوو، بەپێی قسەکانی رەئووف پاشا «رێگاگرتن لە لکاندنی ویلایەتەکانی رۆژهەلات بە ئەرمەنستان بوو» (١).

دوای چەند مانگێك، لەهاوینی کۆمەلەی جۆراوجۆری «مودافەعەی میللی» کۆنگرەیەکدا ٥ ای حوزەیران ـ ٧ ئاب کە بە کۆنگرەی ئەرزەرۆم ناوی دەرکرد کۆبوونەوە تا کارەکانیان رێك بخەنو «پەیماننامەی میللی»ی تورکان بنووسن. بە پێی

ئەم پەیماننامەیە، نەتەوەپەرستانی تورك خوازیاری سەربەخۆیی تەواوی سیاسیو عەسکەری تورکیا «لەسنووره نێودەولەتییەکان»و ئازادی میللەتانی موسلمان، بوون.

کۆنگرەی ئەرزەرووم لە ١٥ی حوزەیراندا، بەتەلگرامێك بۆ ئاستانە ناوەرۆکی پەیماننامەکەی بە سولتان (وەحیدئەلدین) گەیاند، دوارستەی تەلگرامەکە، بۆنی هەڕەشە لە هاوپەیمانانی لێ دەهات کە دەیگوت، «ئێمە بەدنیای نیشان دەدەین کە ئیرادەو ئازایەتی تورکانو عوسمانیان دەتوانن چ کارێك بکەن». (سەرنج بدەنە دوو سیفەتی هاوکاتی تورکو عوسمانی).

کۆنگرەی سیواس لە کۆتایی پاییزی ١٩١٩، ئەوکارەی لە کۆنگرەی ئەرزەرۆم دەستی پێ کرابوو، تەواوکرد. مستەفا کەمال وەك «سەرۆکی کۆمیتەی راپەراندنی بەرگری نەتەوایەتی» سەرۆکایەتی ئەو کۆنگرەیەی بەئەستۆوە بوو. پەیماننامەی نەتەوایەتی بەتێکرای دەنگ پەسندکرا. ویلایەتەکانی ئەناتولی رۆژهەلاتی پەیوەندی خۆیان لەگەڵ ئاستانەدا پساندو کۆمیتەی راپەراندن ناوی حکومەتی لەخۆی نا. ئەنجامی ئەم کارە رووخانی حکومەتی داماد فەرید پاشا لە ئاستانەبوو.

ئەو سەرۆك وەزیرەی جێگای گرتەوە، بەزوویی هەڵبژاردنی ئەنجومەنی نێردراوانی رێك خست کە زۆربەی نوێنەرەکانیان لە پەیماننامەی نەتەوایەتی رازی بوونو لە ٢٠ی تەمموزی ١٩٢٠دا پەسندیان کرد. لەدواییدا لە ٢٩ی کانوونی دووەمی ١٩٢٠دا «بیوك ملی مەجلسی» (ئەنجومەنی گەورەی نەتەوەیی) لە ئەنقەرە کرایەوە.

هاوپەیمانان بۆئەوەی لەنێو خۆیاندا باشتر پیلان لێکتر بگێرن، هەریەکەیان لەلایەن خۆیەوە یارمەتی (مستەفا کەمال)یان دەدا. ئازووخەی ئەلمانەکان لەتورکیا، کۆگا گەورەکانی نارنجۆكو فیشەكو تفەنگ کە ئینگلیزەکان دەستیان بەسەردا گرتبوو لەرێی نهێنی ـ ئامێزەوە کەوتنە دەست تورکان. ئیتالییەکان سکەی شەمەندەفەری ئەنتاکیا ـ قونیەیان کردە پردێکی واقیعی بو ناردنی چەكو کەلوپەل بۆ تورکان. هەر بەم شێوەیە خزمەتگوزاری لەلایەن فەرانسەییەکانو لەرێگای جاددەکانی ویلایەتی کیلیکیەوە ئەنجام دەدرا.

لەم وەزعەدا، بەنرخترین ئەو یارمەتییانەی بە مستەفا کەمال دەدران بێ ئەملاو ئەولا لەلایەن سوفیەتەوە دەهاتن. ئەو زۆر زوو، لەسەرتای ١٩١٩ کە هێشتا لەئاستانەبوو، پەیوەندی بە بەلشەفیکەکانەوە کردو ئەم کارەی لەرێی ئاشناکانی سەرهەنگ (شوارتز)ی ئەلمانی دۆستییەوە ئەنجام دابوو. دوای ئەوەی بەنهێنی لەگەڵ کارمەندێکی بەلشەفیك بەناوی خوازراوی (کاتز) لەئاستانە کۆبۆوە، (جەلال نوری) رۆژنامەنووسی نادرە مۆسکۆ کە لەوێ لەلایەن لینینەوە رێزی لێ گیراو پارەیەکی زۆری بەمەبەستی «پروپاگندەی کۆمۆنیستی» وەرگرتو لەرێگای باکۆوە، گەرایەوە ئەرزەروم. لەوە بەدوا مستەفا کەمال پەیوەندی بەردەوامی خۆی لەگەڵ دەولەتی سوفیەت درێژە پێدا، لەم کارەدا ئەندامانی حزبی ئیتیحادو تەرەقی بەشێوەیەکی کاریگەر یارمەتی حکومەتی «میللی»یان، هەرچەندە پاشان بەهۆی ئەوەی تێکۆشان بەیارمەتی «دۆستانی» رووسی دژی کەمال پیلان بگێرنو هەتا بەنرخی کۆمۆنیست بوونی تورکیاش، حکومەت بەدەستەوە بگرن، بەتووندی سزا دران. (٢)

ڕێبەرانی حزبی ئیتیحادو تەرەقی دوای ڕاکردن لە تورکیا لە بەرلین کۆمەڵەیەکی پان ـ ئیسلامیستیان پێك هێنا کە ئامانجی وروژاندنی میللەتانی موسلمان و گوشارخستنەسەر هاوپەیمانان بوو. دوای ماوەیەك، دوای ڕێکەوتنێکی سەرەتایی لەگەڵ بەلشەفیکەکان چوونە مۆسکۆ، چونکە لەخەباتدا دژی ئینگلیزەکان یارمەتی سوفیەتیان لەیارمەتی ئەلمانەکان بەباشتر زانیبوو. ڕێبەرانی ئیتیحادو تەرەقی بۆئەوەی شایستەی هاوکاری بن، پەیمانیاندا کە «ئازادی نەتەوە موسلمانەکان» واتە تورانیانی دانیشتووی سوفیەتو ناوچەکانی قەڵەمڕەوی ئەو وڵاتە لە لیستی خواستەکانی خۆیاندا ڕەش بکەنەوەو تەنیا دژی دەوڵەتانی ئیمپریالیست، خەبات بکەن. ئەم سەرەتایە گاڵتەجارییەکی سەیربووُ لەمێژووی هاوچەرخدا: هاوکاری کۆمۆنیستانی ڕووس لەگەڵ پان تۆرانیستەکانی تورك.

*****

ڕووسەکان کە لەنرخی گفتوپەیمانەکانی تورکان بێ ئاگانەبوون، مەبەستیان بوو، بەم بارەوە سوود لەبوونی لایەنگرانو ئەندامانی حزبی ئیتیحادو تەرەقی بۆ سۆفیەت کردنی جیهانی ئیسلامیو بەتایبەتی خودی تورکیا، وەربگرن. لەبەر هەندێ پشتگیری نەخشەکانی ئەنوەر پاشاو بەدری پاشایان کردو لەسالی ١٩١٩ «کۆمەڵەی ئازادی ئیسلام»یان دامەزراند کە وابەستەی بەشی موسلمانانی دەزگای کاروباری ڕۆژهەڵاتی کۆمیسارییای دەرەوەی سۆفیەتی بوو. بنکەی هەمیشەیی ئەم کۆمەڵەیە لە مۆسکۆ بوو. کۆمەڵە لەدووبەش پێك هاتبوو: کۆمیتەی ناوەندی ڕۆژهەڵاتو ڕۆژئاوا. گروپێك کە لەبەرلین جێگیربووبوون، خۆبەخۆ بەشێوەی کۆمیتەی ناوەندی ڕۆژئاوای لێهاتو کۆمیتەی ناوەندی ڕۆژهەڵات لە یەکێك لەشارەکانی ئەناتولی جێگیربوو.

کۆنگرەی سیواس کە بەهۆی ئامادەبوونی نوێنەرانی قەفقاز، ئێران، تورکستانو شوێنەکانی دیکە بەتووندی ڕەنگی پان تورانیستی گرتبوو، بڕیاریدا بنکەیەك بۆ «کۆمەڵەی ئازادی ئیسلام» لە ئەناتولی دامەزرێنێ. لەم کۆنگرەیەدا نوێنەرایەتی بەشی موسلمانانی دەزگای کاروباری ڕۆژهەڵاتی مۆسکۆ، لەئەستۆی (ئاقایار مەحمودوف)ی نوێنەری تەتەربوو. ڕووسیای سۆفیەتیش وەك «دۆستو داکوکیکەری ئیسلام»و بەتایبەتی «تورکیای شۆڕشگێر»، هۆکاری گرنگی خەباتی دژی ئیمپریالیستی بەشداری تێدا کردبوو، و لەزمانی نوێنەرەکانییەوە بەرەسمی ڕێو شوێنی پەیماننامەی نەتەوەیی قبووڵ کردو بۆ وەرگرتنەوەی کیلیکیە، سوریا، میزوپوتامیار عەرەبستان، گفتی بەتورکیادا.

لەباتی ئەوە ،تورکەکان گفتیان دەدا کە مۆڵەتی ئاژیتاسۆرە کۆمۆنیستەکان لە وڵاتەکیان بدەنو ئاسایشی شەخسییان دابین بکەن، گفتێك کە بەزوویی پێشێل کرا.

ئەمە بوو ئەو قازانجە زۆر بەگومانو پڕ لە مشتومڕەی کەلەبەر خاتریان ڕووسیای سۆفیەتی مافی ئەو ئەرمەنانەی کردە قوربانی کە مێژووی چەند هەزار ساڵەو مافی سیاسی بێ ئەولاو ئەولایان لە ئەناتولی ڕۆژهەڵاتدا پێویستی بە سەلماندن نەبوو، ڕێك دوابەدوای ئەو هاندانەی سۆفیەت بوو مستەفا کەمال دەمامکی لەروو داماڵیو دژی هاوپەیمانان شەڕی ڕاگەیاند.

لێرەدا مەبەستمان ئەوە نییە گۆڕانکارییەکانی ئەم شەڕە لێك بدەینەوە. ئەوەندە بەسە بڵێین ئەم شەڕە بە ڕێککەوتننامەی لۆزان (٢٤ی تەمموزی ١٩٢٣) کۆتایی هات کە

بەهۆیەوە میللەتێکی گچکە شایەدی نێژرانی ئامانجەکانی بەدەستی «هاوپەیمانە گەورەکان» بوو، دوای ئەوەی تا دوا دەم بەکاریان هێنار پاشان کاری زاڵمانەی شواڵیە تورکچییەکانیان پەسندکرد. ئەگەر تورکیای «نەتەوەیی» بە پاراستنی ئەناتۆلی ڕازی دەبوو، ئەگەر «سەربەخۆیی تورکیا لەسنوورە نەتەوەییەکەی»ی دەکردە ئامانجی، دیسان، لێدانێك کە لەقەوارەی جەستەیی و سیاسیی میللەتی ئەرمەنیدا، تارادەیەك بەرگەی دەگیرا.

بەڵام تورکان سیفەتی «نەتەوەیی»یان لەمێژەوە بە واتایەکی فراوانترو دەرەوەی نەتەوەکانی تورکی ئەناتۆلی هەڵبژاردبوو تا لەناویدا تورانیان یان بەلایەنی کەمەوە ئۆغۆزییەکان کە بەباوەڕی ئەوان خوازیاری یەکبوونن، لەگەڵیاندا، بگونجێنن. مەبەستی پەیماننامەی نەتەوەیی لە «سنوورە نەتەوەییەکان» سنووری نیشتمانی یان جوگرافی نەبوو، بەڵکو سنووری نەژادی بوو.

*****

تورکیای نوێ وەك دووەمین ڕەگەزی بەرنامەکەی خۆی دەیویست ڕێگای توران بەکراوەیی بهێڵێتەوە. لەبەر هەندێ لەیەکەمین پەردەی شەڕی سەربەخۆییدا، کۆنگرەی سیواس (خەبات تا مردن)ی نە تەنیا دژی (ئەرمەنستانی گەورە)، بەڵکو دژی بوونی هەر جۆرە دەوڵەتێکی ئەرمەنی، ڕاگەیاند.

ئەگەر یەکەمین مادەی بەرنامەی نەتەوەیی، واتە ئازادکردنی ئەناتۆلی یەکسان بوو بە دەرچوونی حوکمی مەرگی ئەرمەنستانی یەکگرتوو،دووەمین ماددەشی واتە بڕیار لەپاراستنی ڕێگای توران دەبووە هۆی لەنێوچوونی مسۆگەری کۆمارە گچکەکەی ئەرمەنستان، بۆیە هێرشی گشتی بۆسەر ئەرمەنستان لە کۆنگرەی سیواسدا (١٩١٩) داڕێژرا«٣». هەر لەم کۆنگرە مێژووییەدابوو، تورکیاو ئازەربایجانی قەفقاز بنچینەی یەکێتییەکیان داڕشت کە دوای یەك مانگ (تشرینی یەکەمی ١٩١٩) بە پەیمانی ئاستانە لەنێوان (کەریمۆف)ی نوێنەری ئازەری و (جەواد بەگ)ی نوێنەری مستەفا کەمال مۆرکرا.

لە پەیمانی ناوبراودا هاتبوو:

ئەلف: هەردوولا لەمەولی پاراستنی یەکپارچەیی وڵاتەکەیاندا یارمەتی یەکدی دەدەن.

بێ: ئازەربایجان نەچێتە هیچ یەکێتییەکەوە ئەگەر تورکیا ڕازی نەبێ.

جیم: دەبێ لەشکری ئازەریان لەلایەن ئەفسەرانی تورکەوە مەشق بدرێن.

پاشان تورکیا کە پێداویستییەکانی سەربەخۆیی خۆی دەزانیو تێبینی دیکەشی لەبەرچاو دەگرت، نەیتوانی (یان نەیدەویست) تا کۆتایی پشتیوانی لە سەربەخۆیی ئازەربایجان بکا. بێجگە لەوەش، نەیتوانی قەناعەت بە ئازەرەکان بکا کە بە «شێوەیەکی کاتی» مل بۆ سۆفیەتی کردنی وڵاتەکەیان بدەن. بەڵام لەگەڵ هەندێشدا زۆر بەگەرمی بەرگری لەبەرژەوەندییەکانی نێو قەڵەمڕەوەکەی کردو چەند ناوچەیەکی بەخاکی ئازەربایجانەوە لکاند.

*****

لە سیواس تورکو ئازەر سیاسەتی خۆیان لەبەرامبەر گورجستاندا یەکخستو بڕیاریاندا (بەشێوەیەکی کاتی) ئەم وڵاتە لەگەڵ ئامانجەکانیاندا بگونجێنن، واتە هەر

جۆرە هەوڵێکی هاوکاری نێوان ئەرمەنو گورجی‌یەکان نەهێڵن. دوای هەندێ، ئەنجامی ئەو دانوستانەی لە هاوینی ١٩٢٠ لە تەفلیس بەڕێوەچوو، پەیماننامەی بێلایەنیی تورکیا - گورجستان بوو، کە فوئاد پاشاو یوسف کەمال بەگ وەك نوێنەری تورکیا مۆریان کرد. بەپێی ئەو پەیماننامەیە گورجی‌یەکان ئیلتیزامیان دەدا کە خۆ لەشەڕی نێوان تورکو ئەرمەنان نەگەیەننو لەباتی ئەوەش دەست بەسەر ناوچەکانی بورچالو، ئەخالقلاکی‌و ئەردەهان دابگرن.

لەپاییزی ١٩١٩ پەیماننامەیەکی دیکە لە سامسۆن لە نێوان مستەفا کەمالو سوفیەتی‌یەکاندا مۆرکرا. لەم پەیماننامەیەدا سوفیەتی‌یەکان (چرای کەسکیان) لەسەر هەموو مەسەلەکانی نێوانیان (لەوانە لەنێوبردنی ئەرمەنستان بۆ «هاوپەیمانەکەیان») داگیرساند. ئەگەری ئەم کارەیان، نیگەرانی ئەوان بۆ پاراستنی ڕێگایەك بۆ فەلاتی ئەناتۆلی بوو. لەبەر هەندێ دەکرێ بگوترێ، کۆکردنەوەی لەشکر لەلایەن ژەنەراڵ کازم قەرەبەکر نەتەنیا پێشتر بەرنامەڕێژکرابوو، بەڵکو زۆر زوو دوعای خێری سۆفیەتی‌یەکانیشی وەدەست هێنابوو. لەوەدا مستەفا کەمال توانی زەمینەی تێك گەیشتنێك لەگەل (فەیسەل)ی جێنشینی حیجاز بدۆزێتەوەو لەم لایەنەش بێ لایەنیی ڕازی دابین بکا.

******

لەلایەکی دیکەوە، دانیشتنی کۆمیتەی ناوەندی ڕۆژئاوای کۆمەڵەی ئازادی ئیسلام لەکانوونی دووەمی ١٩٢٠ لەبەرلین ئەنجام درا، لەم کۆنگرەیەدا حسین ڕەشید بەگ (نوێنەری ناوەندی جیهانی) کوچك تەلعەت (نوێنەری حزبی ئیتیحادو تەرەقی) نوری بەدری بەگ (نوێنەری کوردەکانی ئەناتولی)، بەهجەت ڕیاز (نوێنەری ئەفغانەکان)، حسین ئەلئویسی (نوێنەری نەتەوەپەرستانی میسر)، قازی زادە (لەئازەربایجانی ئێران)، ئاقانور هەمەدانی «لەلایەن نەتەوەپەرستانی ئێران» بەشدار بوونو تەلعەت پاشا سەرۆکایەتی دەکردن.

حسین ڕەشید بەگ ڕاپۆرتێکی خوێندەوە کە تەئکیدی دەکرد بەبەرەکەتی یارمەتی‌یەکانی سۆفیەت ئەنجام - گەلێکی درەوشاوە بەدەست هاتووەو پەیام بۆ میللەتانی ئیسلامی لەهەموو جێگایەکدا، ڕەنگدانەوەیەکی باشی هەبووە، خڕبوونەوەی ناوبراو پێویستی خولقاندنی پەیوەندی‌یەکی پتەوی لەنێوان گرووپە «ئیسلامی - بەلشەفیکی»یەکان (لەوانە ئیتیحادو تەرەقی) لەلایەك لەگەڵ نەتەوەپەرستانی تورکو لەلایەکی دیکەش لەگەڵ (یان ژەرمەنیستەکان) تەئکید دەکرد. جارێکی دیکە ئەرمەنستان وەك لەمپەرێك کە هێزەکانی لایەنگری مستەفا کەمالو بەلشەفیکەکانی «٤» لێك جودا دەکردەوە، مەحکوم کراو دەبوایە لەسەر ڕێگا لابدرێ.

بەهۆی ڕێکەوتنێکی نهێنی - ئامێز، هاوکاتی دانیشتنی پیلانگێریی بەرلین، لەئاستانەش لە ٢٩ی کانوونی دووەمی ١٩٢٠ر لەبەرچاوی هێزە داگیرکەرەکانی هاوپەیمانان، کۆبوونەوەی بەنێوبانگی زانکۆ پێك هات. گوتاری ئاگرین لەلایەن حەمدوللا سوبحی (سەرۆکی پێشووی تورك ئوجاقی ئاستانە)و خاتوو خالیدە ئەدیب، چیرۆکنووسی بەنێوبانگو نووسەری کتێبی (تورانی نوێ)و بەتایبەتی یوسف ئاقچورا،

دامەزرێنەری پان تورانیزم، دران.

دوای گوتاری خالیدە ئەدیب کە قسەکانی پەیامێك بوون بۆ هاوکاری‌و کار لەپێناوی پاراستنی دەستەلاتی تورکان بەسەر قەفقازو تورکستانەوە، ئاقچورا گوریسی قسەی بەدەستەوە گرت‌و رێزی لەشەهیدانی دەردەنیل نا کە «لەرێی ئازادی میللەتی بێ‌بەشی تورك»دا گیانیان بەخت کردبوو. ئەو گوتی: فیداکاری‌یەکانی ئەوان لەئازادی ئازەربایجاندا بەری داوە. لەدرێژەی قسەکانی‌دا، گوتی: «دەبی ئەرمەنستان، ئەم لەمپەرەی دەولەتانی ئەورووپایی لەنێو دووبەشی برای میللەتی ئێمەدا واتە تورکانی ئەناتۆلی‌و تورکانی قەفقازدا دروستیان کردووە، لابرێ لەنێوبچێ» (٥).

وەجۆش کەوتنی خەلك کە لەنێو تەلارو دەرەوەی‌دا کۆبووبوونەوە، وەسف نەدەکرا، چەند تەیارەیەکی شەڕکەری هاوپەیمانان بەسەر زانکۆوە هەلدەفرین بەلام تورکان جگە لە نەفرەت‌و بەدگومانی، هەستێکی دیکەیان لەبەرامبەر دەرنەدەبری، بۆیە گوێیان بەو هێز نیشاندانە نەدا. ئاقچۆرا لەکۆتایی قسەکانی‌دا، گوتی «هەرچەندە تورکیا ئەمرۆ لەرووی عەسکەری‌یەوە تێ‌شکاوە، بەلام لەرووی سیاسی‌یەوە سەرکەوتووەو ئەویش بەبەرەکەتی پان تورانیزم».

***

دوای چەند مانگێك، لەئەیلوولی ١٩٢٠ لەباکۆ کە تازە بووبووە سوفیەتی، (کۆنگرەی گەلانی رۆژهەلات) پێك هات. سالێك پێش ئەوە، لینین لە راگەیەنراوێکی نارەسمی‌دا تەئکیدی کردبوو کە رووسیای سوفیەتی لەگەل ئینگلتاندا لەباری شەڕدایە، کۆنگرەی باکۆ بەرێکخستنی ئەو پێداویستاینەی بۆ ئەو کارەپێویست بوون، ئەم گوتەیەی لینینی پەسند کرد.

گوتارەکانی کۆنگرە پڕبوون لەزاراوەی (تەکنیکی) بەتایبەتی ئایدیۆلۆژیکی، بەلام ئێمە وامان پێ باشترە کە ئەوشتە بەزمانێکی سادەتر دەربڕین.

لەم کۆنگرەیەدا (١٨٢٣) نوێنەر بەشداربوونو (هەندێ سەرچاوە ژمارەی بەشداربووانیان زۆرترو هەندێکیان کەمتریان داناون) لەم ولات‌و نەتەوانەی خوارەوە هاتبون: تورکیا (زۆرینەی نوێنەرەکانیان پێك دێنا)، تورکستان، خیوە، بوخارا،قازان، قەلموقستان، قەرقیزستان، داغستان، ئازەربایجان، گورجستان، ئێران، ئەفغانستان، چین، هیندو چەند ولاتێکی دیکە.. کە نوێنەرانی ئەرمەستانیش (واتە بەلشەفیکانی ئەرمەنی) بەشداری‌یان تێداکردبوو.

گوتاری دەستپێك لەلایەن هاورێ (نەریمان نەریمانۆف)ی سەرۆکی سۆفیەتی کۆمیسارەکانی گەلی (سوفنارکوم) ئازەربایجان، خوێنرایەوە، رایگەیاند: «دەمی تۆلە گەیشتووە.... رۆژهەلاتی کۆن راگادێ‌و خەباتی رزگاریخوازی خۆی دەست پێ‌دەکا».

دووەم گوتاربێژ (زینوفیف)ی سکرتێری گشتی ئینتەرناسیونالیزمی سێیەم بوو کە پرسی: «مەگەر ئێمە ئاسیایی نین؟» نوێنەری رووسیای نوێ بەم رستەیە نوێنەرانی گەلانی رۆژهەلاتی غافلگیر کردو بەراگەیاندنی جیهادی پیرۆز دژی ئینگلیستان، کۆتایی بەقسەکانی هێنا. (بۆ زانین خۆی یەهودی بوو، بەرەسەن (ئەپفل باوم) ناودەبرا).

مستەکان بۆ ئاسمان بەرزکرانەوەو ئەم کۆنگرەیە کۆمۆنیستی‌یە زۆر سەیرە شمشێری رووت‌و ئاوازی سروودی «ئینتەرناسیونال» کە ئورکستەر دەیژەنی، تەئکیدی لەسوێندی یەکێتی دژی دنیای رۆژئاوا کردەوە، دیدی هاوبەشی رووس‌و تورکان لەم کۆبوونەوە دەگمەنەی مێژووی رۆژهەلات کە بەرووکەس بەگالتەیەکی ناپەسند دەژمێردرا، لەهەناوی‌دا زۆر ترسناک‌و بەتایبەتی بۆ ئەرمەنەکان تراژیدیا بوو، رووسەکان تێ دەکۆشان سوود لەمەیلی سەربەخۆیی خوازانەی گەلانی رۆژهەلات‌و ئایینە هاوبەشەکەیان (ئیسلام) وەربگرن‌و ئەوان بخەنە خولگەی خۆیانەوە بەگوتەی بوخاریم لە «تیوری ئابووری گوێزەرەوە» بزافە شۆرشگێری‌یەکانی ئەو سەردەم لەهیندەوە تا ئێرانو میسرو تورکیا. هەرچەندە «دەبێ ناوەرۆکی چینایەتی بوون‌و مەیلی ناسیونالیستی‌و بۆرژوازیی بەسەریاندا زالە. بەلام لەهەمان باردا، بەو واقیعە سادەیەی کە دژی ئیمپریالیزمی ئەوروپایین، دەتوانری سوودیان لێ وەربگیرێ». ئەمەبوو روانگەی رووسەکان دەربارەی خەباتی رزگاریخوازی نەتەوەیی. لەکاتێکدا خۆیان وەك هاوپەیمانو قارەمانی «شەری‌سەربەخۆیی» بەکۆنگرەی گەلانی رۆژهەلات ناساند.

ئەمما تورکان تێ‌دەکۆشان بە قبوول‌کردنی درووشمە کۆمۆنیستی‌یەکانو خۆنیشاندان کە هۆکارێکی گرنگی شۆرشی جیهانین، رووسەکان هەلخەلەتێنن. ئەم کارە رێی لەوە نەدەگرت کە لەژێرەوە لەپێناوی نەخشەکانی خۆیاندا کاربکەن: یەکێتی‌ی ئیسلام لەدانوسان لەگەل نوێنەرانی رۆژهەلاتی ناوەراست‌و پان تورانیزم لە دانوسان لەگەل نوێنەرانی ئاسیای ناوەراست. ئەودەم سورتشی بوو کە تورکان مەیلێکی وایان بەخەباتی چینایەتی نەبێ‌و مەیلیان بەپتەوکردنی دەستەلاتی رووسەکان بەسەر ئاسیاوە، لەوەش کەمتربوو. هەتا ئازادی میللەتانی موسلمان لەو کۆتە جۆراوجۆرانەی بەملیانەوە بوو، ئەوانی سەرکوت دەکرد، بۆ ئەوان وەك یەك وابوو. ئەوان تەنیا بیریان لەیەك میللەت‌و یەك کۆت دەکردەوە: میللەتی توران بەندی رووس.

ئیسلامیگەریی ئەوان تارادەیەك واقیعی بوو کە لەگەل پان تورانیزم‌دا دەگونجا یان بەلایەنی کەمەوە، پتەوی دەکرد.

لەروانگەی خەلکی تورك نەژادی پێشووی رووسیا کە هاتبوونە باکۆ، کۆنگرەی گەلانی رۆژهەلات هەلێکی لەباربوو بۆ نوێنەرانیان کە بتوانن لە پەراوێزی دانیشتنە رەسمی‌یەکانی کۆنگرەدا یەکدی ببینن‌و راوێژبکەن. ئەم جارە بە پێچەوانەی کۆنگرەکانی موسلمانانی سەردەمی تزار لە بەکارهێنانی زاراوەی کۆمۆنیستی بێ ناوەرۆك راحەت بووبوون‌و دەیانتوانی بەزمانێکی ئاسایی بدوێن‌و لەمەر هەلبژاردنی تاکتیکی گونجاو لەگەل بارودۆخی نوێی سەردەم گفتوگۆ بکەن. لەباتی پرانسیپی «هاوکاری نەکردن لەگەل غەیرە دینان» فۆرمۆلی «سوود وەرگرتن لە کۆمۆنیزم بۆ ئامانجەکانی خۆمان»یان هەلبژاردبوو.

بەشێك لەنامەیەك کە کۆمۆنیستێکی لاوی خەلکی قەرقیزستان لەسالی ١٩٢٠دا نووسیویەتی‌و مەیلی واقیعی ئەم «هاوپەیمانە»ی سۆفیەتی‌یەکان نیشان دەدا، بەم شێوەیەیە: «ئەگەر خۆمان، خۆمان خستۆتە ژێر ئالای کۆمۆنیزمەوە، لەسۆنگەی ئەوەیە کە بیرمان لەرزگاری نەتەوەیی‌یە نە شتێکی دیکە».

دوو تیوری یەکێتیی ئیسلام کە رووس‌و تورك بەرزیان دەکردەوە نەك هەر بەتەواوی لێك جودابوون، بەڵکو دژی یەکدیش بوون.

سۆفیەتی‌یەکان دژایەتی وایان لەگەڵ ئەو (یەکێتیی ئیسلام)ەی کە لەدەرەوەی سنوورەکانیان (لە هیندەوە تا مەراکیش بەتایبەتی لە وڵاتانی غەیرە تورکدا) چالاك بوون، نەبوون، هەتا بڕەویشیان پێ دەدا. بەڵام یەکێتیی موسڵمانان لەخاکی ئیمپراتۆریەتی رووسیا کە ئێستا سوفیەتی کرابوو لەژێر پەردەداو بە جۆرە پان تورانیزمێکیش دەژمێردرا، بەهیچ شێوەیەك نەیاندەتوانی بەرگەی بگرن.

ئەنوەر پاشا لەنامەیەکدا بۆ سەرۆکی کۆنگرە، سوپاسی ئینتەرناسیونالیزمی سێیەمی کردبوو کە مۆڵەتی داوەتە کەسانێك کە «دژی ئیمپریالیزم خەبات دەکەن» لە باکۆ کۆببنەوە. لەمەنامەیەدا، ئەنوەر کە تا دوێنێ لەلایەن ئەڵمانیای ئیمپراتۆری‌یەوە رێزی لێ دەگیراو هاوکاری دەکردن، نەفرەتی لە ئیمپریالیزمی ئینگلستانو هەروەها ئیمپریالیزمی ئەڵمانی دەکردو مەحکوومی دەکردن. ئەو وەبیر رووسەکانی دێناوە کە چۆن تورکیا بەداخستنی تێشکانی ئیمپراتۆریی تزاری‌و لەئەنجامدا باری سەرکەوتنی بەلشەفیکەکانی کردووە، یان چۆن، خودی ئەو لەکاتی یارمەتی دانی شۆڕشگێرانی رووسی کەشتی‌یەکەی لەدەریای رەشدا شکاوەو رێگاگرتن لەهەڵفرینی فرۆکەکەی بۆتە هۆی ئەوەی نەتوانێ خزمەتی شۆڕشی جیهانی بکا. «تەواوی ئەم قسانە درۆ بوونو بەرووداوی هاوشانی چیرۆکی رۆژهەڵاتی دەژمێردران». بەم بارەشەوە، رووسەکان باش ئاگاداری چالاکی‌یەکانی ئەنوەرو هاورێکانی لە قەفقازو ئەفغانستانو تورکستان بوون. ئەوان قەت بیریان نەکردبوو کە لەمانگی نیسانی هەمان ساڵدا (١٩٢٠) کاتێ لەشکری سۆر بەرەو ئازەربایجان دەچوو، لەگەنجە خۆیان لەبەرامبەر لەشکری نوری پاشای پان تورانیستی برای ئەنوەر کە لە ئازەرە موساواتی‌یەکانو تورکانی عوسمانی پێك هاتبوو، دیبۆوەو رێگایان لێ گرتبوون.

لە کۆتاییدا بەلشەفیکەکان هێشتا تووڕەیی‌و نەفرەتی خۆیان لە «پێشوازی بەشێوەی عەبدولحەمید» کە مستەفا کەمال لەو ئاژیتاسۆرانەی ئینتەرناسیونالیزمی سێیەم بۆ ئەناتۆلی ناردبوون، کردبووی، فەرامۆش نەکردبوو: مستەفا سوبحی وەرگێری (سەرمایە)ی کارل مارکس بۆ زمانی تورکی‌و سێزدەکەس لە هاورێکانی بەهەنجەتی گێرانەوەیان بۆ سۆفیەت، لە تەرابزوون بەزۆر سواری کەشتی‌یان کردبوونو ئیدی شوێنەواریان نەمابوو. مستەفا کەمال لەوەرامی «چیچرین»ی کۆمسارییای کاروباری سۆفیەتی کە لەمەڕ چارەنووسی مستەفا سوبحی پرسیاری کردبوو، زۆر ئاسایی گوتبووی: «ئەم جۆرە رووداوانە لەکاتی زریاندا لەدەریای رەش، زۆر دەقەومێن».

وەرامی زینوفیف توورەو هەڕەشە ئامێزبوو: «ئەنقەرەو کەمالی‌یەکان کە لە تیرۆرانیانداشەخسی سولتان پیرۆزە، هیچ لێك چوونێکیان لەگەڵ کۆمۆنیستەکاندا نی‌یە» ئەو سیاسەتەی حزبی ئیتیحادو تەرەقی مەحکووم کردو گوتی ئەم سیاسەتە هەم لەگەڵ یەکێتی‌و هەم لەگەڵ پێشکەوتندا پێچەوانەیەو قسەکانی بەئاگادارکردنەوەیەکی وا کۆتایی پێ هێنا: «مەیلەکانی یەکێتیی ئیسلام، ئیتیحادو تەرەقی‌و موساواتیزم ناتوانێ هی ئێمە بێ‌و هیچ پەیوەندی‌یەکی بە کۆمۆنیزمی نێودەوڵەتانەوە نی‌یە».

دوای وەرام دانەوەی زینوفیف، ئەنوەر مۆلەتی قسەکردنی داواکرد، بەلام پێی نەدرا. (ئەم زانیاری‌یانە لەلایەن نوێنەری گەیلان لە کۆنگرەی باکۆ، بەئێمەوە دراوە)، بەلام چ بایەخێکی هەبوو. نامەی ئەنوەر پاشا بەلایەنی کەمەوە ئەم تەئکیدە واقیعی یەی دەکردەوە کە دەیگوت «ئێمە خۆشحالین، کە ئەمرۆ خۆمان بە هاوپەیمانی ئینتەرناسیونالیزمی سێ‌یەم کە وەك ئێمە بەدوای راستی‌دا دەگەرێ، دەبینین. لەنێوچوونی ئەرمەنستان رێك بەشێك لەم راستی یە بوو. لەم بارەیەوە، هیچ خراپ تێگەیشتنێك نی‌یەو تەنیا گونجاندنی بیروکردار لە گۆرێ دایە. لەمەر مەسەلەی دیکە، لەوانەبوو بەرژەوەندی چەند سەت سالەی رووسەکان لەگەل پان تورانیزمو یەکێتی‌ی ئیسلامدا بەرامبەر یەم راوەستێ. لەوانەبوو کۆمۆنیزمو بزووتنەوەی نەتەوایەتی لە بنچینەوە دژی یەکو هەتا دوژمنی یەکدیش بن. بەلام لەمەر ئەرمەنستانو تیزی لەنێوبردنی، جودایی‌یەکانیان نەدەماو زەمینەی رێککەوتن وەدەردەکەوت.

تورکیا دەیویست جارێکی دیکە خاکی قەفقاز کە هاوپەیمانانی «ئیمپریالیست» لەکۆتایی ۱۹۱۸دا لەدەستیان دەرهێنابوو، بگرێتەوە. رووسیاش دەیویست هەموو زەوی‌یەکانی سەردەمی تزاری بگرێتەوەو کۆمارەکانی ئەودیوی قەفقاز بکاتە کۆمۆنیست. ئیمتیازی دوولا رێککەوتن لەسنووره هاوبەشەکاندا، خۆش بکا. دروستکردنی سەرە ردێك لە باکۆوە بۆ ئەرزەرۆمو لە ئەرزەرۆمەوە بۆ باکۆ، ئامانجێك بوو، هەردوولا پەیرەویان دەکرد، هەریەکەیان بە قازانجی خۆی‌و بەزیانی لایەنەکەی دی. بو لایەنێك ئەم سەرەپردە رێگای گەیشتنە توران بوو، بۆ لایەنەکەی دیکە، هۆی پاراستنی دەستەلاتی لەقەفقازو لەکاتی گونجاندندا لکاندنی تەنیا ولاتی تورانی - تورکیا بەخاکی خۆیەوە.

***

ماوەیەك دوای رووداوی کۆنگرەی باکۆ کە تێکەلێك بوو لەرووداوی گالتەجاری‌و تراژیدی، لە ۲۸ی ئەیلوولی ۱۹۲۰دا لەشکری کازم قەرەبەکر هێرشی بۆ سەر ئەرمەنستان دەست پێ کرد. لەهەمان کاردا، یەکەکانی لەشکری سۆر کە لەسەربازانی رووس‌و ئازەر پێك هاتبوو لەپشتەوە هاتنە سەر ئەرمەنستان.

هاواری گیان لەدەستدانی ئەرمەنستان لەلایەن «رۆژئاوای شارستانەوە» کە ئەرمەنەکان وێرای خیانەتی ئاشکرایان پێ‌یەوە چەسپابوون. بەگشتی، گوێی پێ نەدراو لەبارێکدا «کومیسەرە بالاکان»ی ولاتە هاوپەیمانەکان لە قەفقاز بینەرو چاودێر بوونو گوتاربێژان لە کۆمەلگای نێودەولەتی‌دا زۆرەوی‌یان دەکرد، لەشکری تورکیا (قارس‌و ئەلکساندروپل)ی گرت‌و جارێکی دیکە خاکی ئەرمەنستان لەخوێنی هەزاران قوربانی بێ گوناهدا نقووم بوو.

تورکیا لەرێی وەدی هێنانی «ئامانجی گەورە»ی خۆی‌دا، وێرای گرتنی زەوی، مەسەلەیەکی فەرامۆش نەدەکرد، ئەویش فەتحی نەتەوەیی نەژادی بوو: کردنە تورکی هەر بستە خاکێکی فەتح کراو. مەگەر ئەمە ئەو شێوە پەرچوو ئاسایە نەبوو کە مۆلەتی بەکازم قەرەبەکردا، ماددەیەك لە رێککەوتننامەی ئالکساندروپل بگونجێنێ‌و ئەرمەنەکان

ناچاربکا وەك راستی راستیەکی سەلمێنراو قبووڵ بکەن کە «هیچ بەشێك لەخاکی ئیمپراتۆری عوسمان، زۆربەی دانیشتوانی ئەرمەن نین؟»(٦).

ذبەپێی ڕێککەوتننامەی ئالسکاندروپل (٣ی کانوونی یەکەمی ١٩٢٠) تورکیا ویلایەتی قارس و ناوچەی سورمالوی لە ئەرمەنستان جوداکردەوەو بەرامبەرەکەی و هاوپەیمانەکەی (سۆفیەت)ی ناچارکرد کە نەخچەوانو قەرەباغ بداتە ئازەربایجانو بەم شێوەیە سنوورێکی گەیشتنی بەپەلەی لەگەڵ ئەم وڵاتە، یان بەدەستەواژەیەکیتر، لەنێوان ئەو «دووبەشە برایەی نەتەوەی تورك» دروست کرد.

لە ١٦ی ئاداری ١٩٢١ ڕێککەوتننامەی دۆستایەتی تورکیاو سۆفیەت مۆرکرا. لەماددەی یەکەمدا، سۆفیەتییەکان، ڕۆو شوێنی پەیماننامەی نەتەوەیی تورکانیان بەرەسمی ناسیو قبوولیان کردو قارس و ئەردەهانیان بە مستەفا کەمال سپارد. لەماددەی دووەمدا باتووم درایە گورجستان. ماددەی سێیەم لکاندنی نەخچەوانی ئەرمەننشینی بەشێوەی «کۆمارێکی ئۆتۆنۆمداری سۆفیەتی» بەئازەربایجان، بریاردرا. ماددەی چوارەم حوکمی لەدەولەتی سوفیەتی دەکرد کە ماددەکانی ئەم پەیماننامەیە بەکۆمارەکانی قەفقاز قبووڵ بکا.

بەپێی ڕێکەوتننامەی قارس (٢١ی تشرینی یەکەمی ١٩٢١) تورکیا جارێکی دیکەش توانی زیاتر بۆ پێشەوە برواو ناوچەی سورمالو کە لەوەدیهاتنی نەخشەکانیدا بایەخێکی زۆری هەبوو، بەخاکی خۆیەوە بلکێنێو لەدواییدا، دوای ماوەیەك قەرەباغی سەروو (ناگورنو قەرەباغ) لە ئەرمەنستان جودابۆوەو بەشێوەی «ناوچەیەکی ئۆتۆنۆم» خرایە سەر ئازەربایجان. (٧)

بەبەرەکەتی ئەم ڕێککەوتننامانە، تورکەکان توانییان سەنگەرەکانی پێشەوەی خۆیان لە ڕۆی توراندا بەدۆزنەوە. ناوچەی نەخچەوان کە هاوسنووری تورکیاو ئازەربایجانی ئێرانە بەهۆی ناوچەیەکی باریك لە ئازەربایجانی سۆفیەتی جودابۆوەو بەشی ئەرمەن نشینی (زەنگزور) بووە چوار ریانێك لەنێوان تورکیاو دوو ئازەربایجانو بەکردەوە ڕێگای چوونە باکۆی بۆ ئەوان دابین کرد.

میللەتی ئەرمەنستان کەلەژێر سەیوانی پاراستنی سوفیەتییەکاندا چاوی لەسەربەخۆیی خۆی پۆشیبوو، بەکردەوە تەنیاو بێ دیفاع و بێ پشتیوانێکی بەمتمانە لەبەرامبەر شەپۆلی ئەم ئۆڤیانوسی تورك مایەرەو کە لە سێ لاوە گەمارۆیان دابوو.

---

- Jean Schlincklin, Angoro, ~Laube dela Turquie nouvelle~ 1919-1922. (١)

(٢) لەساڵی ١٩٢٥، واتە کەمێك دوای مۆتایی هاتنی شەڕە دەرەکییەکان، سەرکوتی یاخی بوونەکانی نێوخۆی تورکیاو دوا چارەسەرکردنی مەسەلەکانی سیاسەتی دەرەوەی تورکیا، کۆمەڵە جۆراوجۆرەکانی باڵی دەسەڵاتداری تورکیای کەمالیست هەلو کاتیان بۆ ڕێك کەوت کە خەریکی جوداییەکانیان بن. ژمارەیەك لەهاوکارانی مستەفا کەمال کە هەندێ کۆنە ئەندامی کۆمیتەی ئیتیحادو تەرەقی پێشوویان تێدابوون، بەشێوەیەکی نەخشەکێشراو خەریکی پێکهێنانی کۆمەڵەی نهێنیو پیلانی کوشتنی مستەفا کەمال بوون، رازیان ئاشکرا، کستەفا کەمال بۆ سەرکوتی تەواوی نارازییەکانی، لەوانە زۆربەی کۆنە ئەندامانی ئیتیحادو تەرەقی، سوودی لەو هەلە وەرگرت، کەسانی وەك زیاد خورشید، عەلی

شەکرو، دکتۆر نازم، کازم قەرەبەکر، حسین جاوید (بەرێوەبەری رۆژنامەی تەنین)و... لەنێو تاوانباراندا بوون. دوابەدوای زنجیرە دادگاییەکی رەسمی لەئەزمیرو ئەنقەرە، ژمارەیەك لەتاوانباران بەئیعدامو زیندانو دوورخرانەوە، مەحکوم کران.

- Rene Pinon ~Loffensive de LAsie~ ~Revue des deux mondes~ Paris, 15 (٣) avril 1920.

- ~Bolsherism and the Turks~ Quarterly Review~ Vol. 239 Janvier - (٤) avril 1923.

- Rene Pinon, art, cite cf. ci-dessus> (٥)

- ~Eclosion et Dereloppement dela... (٦)

خاتیسیان، سەرۆکی دەستەی نوێنەرایەتی ئەرمەنستان لەدانوسانی ئالکساندروپل دەڵێ ئەم بابەتە لە تێکستی ڕێکەوتننامەکەدا نەبوو.

(٧) ئەمرۆ، بەشێکی دی لەناوچەی زەنگزور «کوردکرای» KurdKraiیان ناوی (ناوچەی ئۆتۆنۆمیکورد)ە. ئەم بەشە کە لەنێوان قەرەباغی سەرێو ناوچەی ئەرمەن نشینی (زەنگزور) هەڵکەوتووە، لەقەڵەمرەوی کوماری سۆڤیەتی ئازەربایجان دایە.



# پان تۆرانیزمی ئەمڕۆ

لە تورکیای ئەمڕۆدا «*» پان تۆرانیزم ئەو بزاڤەی دەیتوانی شانازی بەخۆیەوە بکا کە واقیعیەتەکانی کۆمەڵی تورکیای گۆڕیوەو ئاقاریکی نویی(چ لە ناوخۆو چ لە دەرەوەدا)داوەتە ژیانە سیاسییەکەی، ئایا بە مێژوو سپێردراوەو ئیدی لە توانادا نییە ئیلهامبەخشی سیاسی تورکەکانی ئەمڕۆ بێ؟ یان هێشتا زیندووە؟ هەڵوێستی رژێمی «نەتەوەیی ئەنقەرە» لەمەڕ ئەم ئەیدیۆلۆژیایەو بەرەنجامەکانی چییە؟

ئەمڕۆ ئەنقەرە پەیوەندییەکی ئاسایی‌و دۆستانەی لەگەڵ رووسیای سۆڤیەتدا هەیە هەمان دەوڵەتێ کە پان تۆرانیزمی بە دوژمنی راستەقینەی خۆی دانابوو، تەنیا بەڵەبەریەك هەڵوەشانەوەی (ئیمپراتۆریەتی)ی تورك دەتوانێ ئازادبێ‌و ئامانجە ناودارەکەی «تورانی یەکگرتوو و سەربەخۆ» وەدی بهێنێ.

دوای مۆرکردنی پەیماننامەی دۆستایەتی نێوان تورکیاو سۆڤیەت، مستەفا کەمال لەسەکۆی ئەنجوومەنی میللیی گەورەی تورکیادا بەرەسمی یەکێتیی ئیسلام‌و پان تۆرانیزمی مەحکووم کردو گوتی:

«یەکێك لەهۆیەکانی بەدبەختییەکانمان، ئامانجە ناعەمەلییەکانی رێبەرانی رابردووی تورکە، ئەوان خەونی دامەزراندنی ئیمپراتۆریەتێکی فراوان دەبینن کە نەتەوە موسلمان‌و تۆران ـ نەژادەکان یەك بخا. ئەم خەونانە یەکێتیی ئیسلام‌و پان تۆرانیزمیان دروست کردو حزبی (ئیتیحادو تەرەقی)یان هان دا کە لەشەڕی گەورەدا بەشداربێ. بەڵام ئەمانە جگە لەئارەزووی بێ بناغە، شتێکی دیکە نین، ئێمە دەبێ لە سیاسەتدا ئاسایی‌ترو واقیع‌بین‌تر بین، یەکێتیی ئیسلام لە روانگەی منەوە تەنیا مەسەلەی فیکری ئەو پەیوەندییەیە کە وەك میللەتێکی موسڵمان لەگەڵ ئەو برا موسلمانانەی لە دەوڵەتێکی دیکەدا دەژین، هەمانە. پێمان خۆشە ئەوان پێش بکەون‌و خۆشبەخت بن، بەسەربەخۆییان خۆشحاڵ دەبین، بەڵام کاتێ کەسایەتی خۆمان بەپێی یەکێتیی ئیسلام بەرێوەببەین وەك ئەوەیە وڵاتەکەمان بخەینە مەترسییەوەو ئامانجەکانمان لەکەدار بکەین، ئێمە بۆ ئەوان خۆمان بەیارمەتیدەر دەزانین، بەڵام لەبەرخاتری ئەوان هیچ کاتێ لەشەڕدا دەست پێشخەری ناکەین، ئێمە نە پان ئیسلامیستین‌و نە پان تۆرانیست.ئامانجمان گەیشتنە بە سەربەخۆیی واقیعی‌و ئێمە تەنیا ئامانجێکە هانمان دەدا خوێنمان لەرێگایدا بڕێژین.»

ئەم قسانەی سەرەوە کە لەگەڵ ئەوەی لەمەڕ گۆڕانی شێوازی بیرکردنەوەی رێبەرایەتی سیاسیی تورکیا دەگوترا چەند متمانەیەکی بۆ پاراستنی ئاشتی لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا گرتبووەخۆ، چەند باش‌و دڵنیایی بەخش بوو ئەگەر راستی تێدابایە. بەداخەوە،هەروەك (بیسمارك)ی دیپلۆماتی بەناوبانگ دەڵێ: لێدوانی رەسمی تەنیا بۆ شاردنەوەی بیرو نیەتی گۆیندەکانی بەکاردەهێنرێ، نەك ئاشکراکردنیان. بۆیە بۆ

تێگەیشتن لە بەرنامەو ئامانجی دەوڵەتێکی دیاریکراو، نابێ کەس پشت بەلێدوانە ڕەسمی‌یەکانی ڕێبەرە سیاسی‌یەکانی، بەتایبەتی سەرۆکەکەی ببەستێ.

ئاشکرایە ڕێبەری بزووتنەوەی نەتەوایەتی نەیدەتوانی لەسەردەمێك دا کە تورکیا لەبەرەی ڕۆژئاوا سەرگەرمی شەڕی سەربەخۆیی بوو،و جگە لەپشتیوانی ڕوسیا شتێکی دیکەی نەبوو، بە ئاوازێکی دیکە بدوێ. هەمان بەڵگەی هەڵوێستی مستەفا کەمال، حمدالله صبحی سەرۆکی پێشووی (تورك ئۆجاق) لەگفتوگۆیەکی‌دا لەگەڵ ژنە ڕۆژنامەنووسێکی فەرانسەیی، بەکاری هێنا! صبحي دوای گوتارێکی پڕجۆش‌و خرۆشی دووروودرێژ، دەربارەی ئەو بەرنامانەی لەلای هەڵبژاردە سیاسی‌و ڕێبەرە ڕۆشنبیری‌یەکانی تورکیا، پیرۆزبوون، گوتی؛ تەواوی ئەم تیۆرانین‌و وتانە تەنیا خۆی بەمولتەزیم دەزانێ نە غازی پاشا (مستەفا کەمال)و هەمیشە لەنێوان ئەوو کەمال‌دا یەك تیۆرانین نی‌یە، چونکە کەمال وەك سیاسەتمەدارێکی دەوڵەتی‌و سەرۆکی وڵات هەمیشە لەبەرامبەر پێویستی‌یە ڕەسمی‌یەکاندا دەوەستێ، لەکاتێکدا خۆی، تەنیا ڕۆشنبیرێکە.

لەبەرهەندێ، لەمەڕ بەرنامەکانی ئایندە، دیکتاتۆری تورکیاو وەزیری پەروەردەو فێرکردنی حزبی (ئیتیحادو تەرەقی) لەکۆدا هاودەنگن، بەڵام نە بەتەواوی‌و بەردەوام، لەگەڵ ئەمانەش‌دا وادێتە بەرچاو کە جودایی‌یەکان تەنیا پەیوەندی‌یان بەشێوەی کارو شوێنی لەبارەوە هەبووبێ، هەتا لەوانەیە لەڕوانگەی سیاسەتمەدارێکی لێپرسراوەوە پەیوەندی بە نهێنی پاراستنەوە بووبێ کە ڕۆشنبیرێك ئیلتیزامی وای نی‌یە.

ئێمە لەقسەکانی مستەفا کەمال نارازی نین کە کەمالیزم پەیوەندی بە یەکێتی‌ی ئیسلامەوە نی‌یە. لەم بارەدا، دەبێ وەبیرخۆمانی بهێنینەوە کە ئەنقەرە بە لێزانی‌یەکی زۆرەوە ئیسلامی وەك سەرەنێزەیەکی سیاسی بەکاردەهێنا، هێشتا کۆنفرانسی ئیسلامیمان لەبیر نەبردۆتەوە کە هەموو دەوڵەتە موسلمانەکانی تێدا بەشداربوون، واتە موسلمان سونی، بەڵکوو ئەمیری شیعەی کەربەلاش (ئیمام یەحیا ئیمامی یەمەنو سید ئەحمەد سنوسی کە سەرۆکایەتی کۆنگرەشی بەئەستۆوەبوو). غازی مستەفا کەمال نوێنەرانی جیهانی ئیسلامی بو ئەنادۆل بانگهێشت کردبوو،و باسی لەدەستکەوتەکان کردبوو،و ئاگاداری‌یەکی ناڕاستەوخۆشی بۆ ڕۆژئاوا نارد. ئەگەر ئەم کۆنفرانسە بەشێوەیەکی نومایشی بانگی بۆ نەدەدرا، ئەگەر چەند ڕێکەوتننامەیەکی یەکێتی‌ی لەگەڵ ئێرانو ئەفغانستان مۆرنەدەکرا، ئەگەر ڕێکەوتننامەی ملیۆنی لەگەڵ میسرو هینددا مۆر نەدەکراو بەشێوەیەکی گشتی هەموو وڵاتە ئیسلامی‌یەکان گوشاریان بۆ ڕۆژئاوا نەدێنا، زەحمەت بوو بگوترێ تورکیا دەیتوانی سەرکەوتنێکی وەك بەستنی پەیمانی لۆزان کە خۆبەدەستەوەدانی تەواوی هاوپەیمانەکان بوو لەبەرامبەر پەیماننامەی میللی تورکیا، ڕەدەست بهێنێ.

بەڵام سیاسەتی ئیسلامی‌ی مستەفا کەمال کە میللەتە موسلمانە غەیرە تورکەکانی بە مەیلە فراوان خوازی‌یەکەی دەتۆقاند، لەگەڵ(یەکێتی ئیسلام)ی عبدالحمیدو پان - ئیسلامیستی حزبی(ئیتیحادو تەرەقی) جودابوو. تورکیای میللی بڕیاری دابوو ئەو میللەتانە دلنیابکا، ئەم سیاسەتە هیچ بەرنامەیەکی لەمەڕ دامەزراندنی ئیمپراتۆریەتێکی ئیسلامی لەژێر ئاڵای تورکاندا،نەبووە ئامانجی، بەگوتەی خودی کەمال، یەکێتی‌ی

ئیسلام نەبوو، بەڵکو ناسیونالیزمی تورك بوو، سیاسەتەکەشی بریتی بوو لە سوود وەرگرتن لەو هەستی برایانەی کە ئەندامە جۆربەجۆرەکانی دنیای موسلمان لەبەرامبەر یەکدیدا هەیانبوو،و ناساندنی تورکان بەوان نەوەکوو ئاغا، بەڵکوو وەك برا، وەك دۆستو داکۆکی کەری ئامانجەکەیان لەرزگاری میللی، بەواتایەکی دی بەکارهێنانی «فۆرمۆلی نوێی رۆژهەڵاتی لەزەمینەی ناسیونالیزم» وسوودوەرگرتن لە بیروڕای دنیای ئیسلام وەك چەکێکی سیاسی دژی ئەورروپا.

تورکیای نوێ بە وەلانانی پان ئیسلامیزمو دەرسی هەڵێنجراوی ئاسایی عوسمانیەکان لەویدا، شێوەکارێکی نوێی وەك سیاسەتێکی کاریگەر خستەروو، وەك نموونە: دەتوانرێ پەنجە بۆ ئەوە رابکێشرێ کە ئەوان بەسادەیی چاویان لەئایین پۆشی: لەساڵی ١٩٢٤دا ئەنجومەنی گەورەی میللی (خەلافەت)ی هەڵوەشاندەوە، تورکیا بەو کارەی، بەرووکەش نەتەنیا شتێکی لەدەست نەدەدا، بەڵکو دەستکەوتیشی وەدەست دینا، تورکچی‌یەکان گەلێ پێشتر سەرنجیان دابوو کە لەرێگای یەکێتی‌ی ئیسلامو راگەیاندنی جیهادەوە لەسەرەتای شەڕدا، هیچ کەسی لەوڵاتانی ژێر دەستەڵاتی هاوپەیمانەکان (ئینگلیزو فەرەنسا) نەجووڵاندو رانەکێشا، لە جەزائیرەوە تا کەلکەتا موسلمانان شەڕیان کرد، جیهانی ئیسلام سەرباری چەندان دەیە پروپاگندەش، (خەلافەت)ی عوسمانی‌یان پشت گوێ خست. لەنوێژی هەینی‌دا، مەغریبی‌یەکان ناوی مەولائی یوسف، ئەفغان ناوی ئەمیری کابول، عەرەبەکان ناوی حوسین شەریفی مەکە، شیعەکانی ئێرانو عیراقو هیند ناوی حەزرەتی علی (ع)، زەیدی‌یەکانی یەمەن ناوی ئیمام یەحیا، وەهابی‌یەکان ناوی ئیبن سعود، دروززەکانی سوریاو لوبنان ناوی حەکیمو ئێزیدی‌یەکان ناوی (شەیتان)یان دێنا «٤٠٠». لەبەرهەندێ خەلافەتی عوسمانی کە پێشتر شەرعیەتی نەبوو، ناوەرۆكو نرخی واقیعی خۆی لەدەستدا.

لەلایەکی دیکەوە، مەسەلەی خەلافەت، پەیوەندی نێوان تورکو عارەبانی لەماوەی چەندان سەدەدا ژەهراوی کردبوو، لەروانگەی عارەباندا، تورکەکان تەنیا زەفتکەربوون، لەبارێکی دیکەدا نەوەکانی بنەماڵە شەریفەکانی قورەیش هێشتا دەژیانو شتێك، ئەو ئیدیعایەی تورکەکانی بۆ خەلافەتی پێغەمبەری ئیسلام، پاساونەدەدا.

پان تۆرانیستەکان کە هەمیشە پراکتیست بوون، بەزیرەکی خۆیان لەشەری ئەم مایەی دووبەرەکی‌یە رزگارکردو بەو کارەیان عەرەبەکانیان لەگەڵ ئامانجەکانیان گونجاند. یان بەلایەنی کەمەوە بێ‌لایەن کرد، جگە لەچەند شوێنێك، هەموو دنیای ئیسلام ئەم کارەیان قبوول کرد.

ئێستا تورکیای نوێ متمانەی خۆی لەلای وڵاتە ئیسلامی‌یەکان پاراستووە، ئەویش نەوەك بارەگای (خەلافەت)، بەڵکو وەك یەك وڵاتی ئیسلامی سەربەخۆو سەکەوتوو، سەرباری هەندێش، لە روانگەی نەوەی نوێی ناسیونالیستی ئەو وڵاتانە، تورکیا خەون بە وڵاتێکی پێسکەوتووەوە دەبینێو مەیلی فراوانخوازی داناوە.

بەڵام لەمەڕ پان تۆرانیزم، بە پێچەوانەوە، جێگای دوودڵی نەهێشتۆتەوە. بەڵگەی بێ ژمارە پشتگیری ئەمە دەکەن ـ کە ئامانجی تورکچێتی بۆ تورکان بووە ئامانجێکی نەتەوەیی‌و رژێمی نوێ نە تەنیا چاوی لێ ناپۆشێو برەوی پێ دەدا، بەڵکوو کردوویەتی‌یە

جێ چاوی خۆی‌و لەبەردەمی دایە، کارو هەواڵەکانی بزافی «نەتەوەیی» هەمیشە بەهۆی بەرنامەو نەخشەکەی پان تۆرانیستەکان رێبەری دەکراو ئێستاش هەمان باری هەیە.

لەواقیعدا، ئەگەر حکومەتی ئەنقەرە پان تۆرانیست نەبوو، بۆچی هەموو کەسایەتی‌یە بەرزەکانی پان تۆرانیزم وەك یوسف ئاقچورا، ئەحمەد ئاغا ئوغلو، علي حسین زادە، ئەیاز ئیسحاقي، ضیاء گوك ئەلب، فوئاد نوري، ضیاء نور، یەعقوب قەدري، یونس نادي، روشن ئەشرەف، فالح رفقي، لەدەوری خۆی کۆکردبۆوەو خستبووە گەڕ لەبەرزترین پایەی دەوڵەتی‌و ئەنجومەنی‌و نەتەوەیی‌و دەستەی وەزیرانو وەزارەتی پەروەردەو فێرکردنو چاپەمەنی‌و سەکۆ سیاسی‌یەکاندا دانرابوون؟ پەیوەندی ئەوان بەحزبی دەستەلاتدارەوە ئەوەندە نزیك بوو کەرووێکی رێکخراوەیی پەیداکردبوو، ئەو دەمە (ضیاء گوك ئالب) «٣» دامەزرێنەری تورکچێتی، لەپێشەکی کتێبی (تورك چولوق اساسلر) «بنەمای تورکچێتی»ی خۆیدا تەئکیدی کردبوو: «شمشێری خودا لەدەست حزبی خەلك دایە، تورکچی‌یەکانیش قەلەمی خودایان لەدەست دایە»، لەراستی‌دا، ئەم پان تۆرانیستە بەناوبانگانە نە تەنیا لە هەوەلین ساعەتدا دۆستو هاوکاری مستەفا کەمال بوون، بەڵکوو لەوەش زیاتر هاوسەنگەری بوونو بە پێشرەوانی واقیعی بزووتنەوەی نەتەوایەتی دەژمێردران. لەوانەیە لەهەندێ شتدا روانگەی جودا (لەمەڕ رێ‌وشوێن‌و شێوەکار) لەنێوان مستەفا کەمال و«براياني ئامانجو کار»ەکەی‌داهەبووبێ، بەڵام بە مسۆگەری‌و دڵنیایی لەئوسوولدا «یەکبوونی تورکان» بەکاردەهێنرا، لەتورکیای نوێدا واژەی «یەکێتی» قەدەغەکرابوو، (یەکبوون) بەکاردەهێنرا..

ئەم رێ‌و شوێنە لەروانگەی رێبەری تورکیای نوێدا بەرێزبوو، تۆڕێکی بەرفرەی «تورك ئوجاق»ەکان، ئەم کوورەو لانکەی پان تۆرانیزم سەرانسەری تورکیای میللی گرتبۆوە، جێگایەك کە بەبێ ویستی دیکتاتور هەتا گەڵایەکیش نەدەجووڵاوە، سەرۆکایەتی‌یەکەی، بەڵەتیفە خاتوونی هاوسەری مستەفا کەمال کە بەیەکەم خانمی وڵات دادەنرا، سپێردرابوو. (حمداللە صبحي) کاتێ وەزارەتی پەروەردەو فێرکردنی بەرێوەدەبرد، سەرۆکی کۆمیتەی رێبەریی «تورك ئوجاق»یش بوو، عصمت ئینۆنۆ سەرۆك وەزیران ئەندامی «ئوجاق»ی ئەنکارە بوو، زۆریش دەدواو شانازی بە ئەندامێتی خۆیەوە دەکرد.

«ئوجاق»ەکان، ئەم بنکە پان تۆرانیستی‌یانە، نەتەنیا چاویان لێ دەپۆشراو هان دەدران، بەڵکوو هەتا رووێکی رەسمیشیان پەیداکردبوو، بەپێی بریاری ئەنجوومەنی وەزیرانی تورکیا، هەموو کاربەدەستان چ عەسکەری‌و چ مەدەنی دەبووایە تێدا ببنە ئەندام، نوێنەرانی رەسمی مستەفا کەمال لە «قورولتای» «ئەنجوومەنی گشتی ساڵانە»ی ئوجاقەکاندا بەشداریان دەکرد.

ئەگەر ئەوەشی لێ زیادبکەین، کە ئەم بنکانەی سەتاسەت وەفاداری ئامانجەکانی تورکچێتی، پەرۆشترین پشتیوانی غازی پاشاو بەرێکو پێکی پروپاگندەی بۆ دەکەن، ئەوەدەم تێ دەگەین کە سیفەتی (نەتەوەیی) هاوواتای (تورکچێتی)یە، لەسۆنگەی دوا هەوڵی ناکامی کوشتنی مستەفا کەمال، (فالح رفقي) سەرگوتارنووسی بڵاوکراوەی «حاکمیەتی میللي» وای نووسی:

«رووداوی مستەفا کەمال لەساڵی ١٩١٩ەوە دەستی پێ نەکردووە، بەڵکوو

دەگەڕێتەوە بۆ هەوڵێن ساڵەکانی بزاڤی دەستووریی عوسمانی کە دوو تیۆرانینی فیکری دژ بەیەك لەبەرامبەر یەکدیدا ڕاوەستابوون، یەکێك هی «ناوەندی گشتی»ی حزبەو ئەوی دی ئامانجی مستەفا کەمال بوو. ناوەندی حزبی ئیتیحادو تەرەقی کە ئەوان دەمان زۆر بەهێزبوو بۆ بێ دەنگ کردنی کەمال پەنای بردە بەر نێزەی لەناوبردنی جەستە، واتە حەفت تیر کە ئەمرۆش جارێکی دیکەی هەڵدەکێشن، تا دەستەڵات بگرنەدەست».

سەرگوروتارنووسی «حاکمیەتی میللی» بەهۆی ئەوەی کەمال هەتا دوای کۆنگرەی ئەرزەرومو ئەو خۆشگوزەرانیو ئاشتییەی بۆ تورکیای بەدیاری هێناوە، ڕاستی تیۆرییەکانی دەسەلمێنێو بۆ چوارەمین جار هەوڵی کوشتنی دەدرێ، بێزاری دەردەبڕێو دوژمنانی کەمال بە ناجوامێرو نانیشتمانپەروەر دەزانێ کە چاویان بەرایی نادا کارە ئەنجام دراوەکانی ببینن.

لێرەدا پێویستە هەنەی مەسەلەکە لەبەشەکانی پێشوودا (بەشی چوارەم) هێمامان بۆکرد، واتە ململانێی نێوان دوو باڵی عوسمانیو تورکچێتیی ناو حیزبی ئیتیحادو تەرەقیو (سەرکەوتنی باڵی دوایی) دوای شۆڕشی دەستووری ١٩٠٨ تا شەڕی یەکەمی جیهانی، وەبیر خوێنەران بهێنینەوە، ئەودەم تێ دەگەن کە فالح رفقی لەچ تیۆرانینێکەوە دەدوێو ئەو تیۆرانینەی مستەفا کەمال خۆی بەقارەمانی دەزانێ، کامەیە. کەمال نە تەنیا متمانەی ڕژێمی بەهەموو نەتەوەکانی ئیمپراتۆری عوسمانی بەبێ جودایی قبوڵ نەدەکرد، بەڵکوو هەتا ئامادەش نەبوو پشت بەنەتەوە موسلمانە غەیرە تورکەکانی نێو تورکیاو دەرەوەی واتە «ئامانجی ئیسلامی» ببەستێ، مەبەستی بوو تورکیای نوێ نە لەسەر بنچینەی ئایین، بەڵکوو لەسەر بنچینەی نەتەوەونەژاد بنیات بنێ، هەرئەوەندە هەلێکی لەبار ڕەخسا، ئەو ڕێو شوێنەی تاقی کردەوەو بەرنامەی لایەنی کەمی «تورکچی»یەکانی جێبەجێ کرد، (ضیاء گوك ئالب» دەڵێ:

«دەتوانرێ تەئکید بکرێ کە پەیماننامەی میللی، بەرنامی تورکچێتی درێژە پێدەدا»

گوك ئالب لێرەدا بە خۆپارێزییەوە بیروڕاکانی دەدرکێنێ، چونکە لە تورکیای نوێدا نابێ هیچ بیروباوەڕێك جگە لەشەخسی مستەفا کەمال، کەسی دی ڕایگەیەنێ. لەبەرهەندێ. گوك ئالب دەڵێ: هەموو ئیمتیازو شانازییەکانی سەرکەوتن هی کەمالە، چونکە «بەرنامە دارشتن لەدنیای خەیاڵدا کارێکی ئاسانە، بەڵام جێبەجێکردنی گەلەك دژوارە».

دامەزرێنەرانی تورکچێتی کە لەسەردەمی لاویدا بەنرخی خستنەمەترسی گیانیان، خۆیان لەگوتنی «بژی سولتان» بەدوورگرتبوو، ئێستا قبوڵیان دەکرد کە ئەم شانازییە پێشکەشی «قارەمانی ئامانجی تورکچێتی» بکەن.

سیفەتی تورکچێتیی مستەفا کەمال ئەتاتورك نەتەنیا لەکاروباری عەسکەریو جەنگیدا، بەڵکوو لەکاتی ئاشتیشدا دیاربوو، ئەو لەبەرەی ناوخۆدا هەمان ململانێی دێرینی تورکچییەکانی دژی خەڵکی ناوخۆو لایەنگرانی یەکێتیی ئیسلام درێژەپێ داو گەیاندیشیە ئەنجامە مەنتیقیەکەی.

لەساڵی ١٩٢٢دا خەبات بۆ لەناوبردنی دەستەڵاتداریتی ئایینو مەلاکان گەیشتە چلەپۆپە: جودایی سیاسەت لەئایین بەکردەوە جێبەجێ کرا، حوجرەو تەکیەکان داخران،

دامەزراوە خێرخوازی‌یە ئیسلامی‌یەکان ـ حوجرە، خەستەخانە، هەتیوخانە، نانەواخانە ـ بەداهاتە زۆرەکانیانەوە بەوەزارەتی پەروەردەو ناوخۆوە پەیوەست کران، بەهێزی ئەو یاسایانەی کە بە پەلە بریار درابوون‌و هەموو بوارەکانیان دەگرتەوە لەلەچەکی ژنان‌و جل‌وبەرگی پیاوانەوە بگرە تا دەگاتە تراشینی ردێن‌و پەیوەندی خێزان، تورکیا پێی نایە رێگای نوێ بوونەوە. هەمان ئەو ریفۆرمەی تورکچی‌یەکان پێش دە ساڵ پێشنیارو ستایشیان کردبوو، دووەمین ئامانج کە تورکی کردنی تەواوی وڵات بوو، بە کەللەرەقی‌یەکی زۆرەوە لەلایەن کەمالەوە درێژەی پێدرا. تورکە لاوەکان کەنیوە ئیسلامی‌و نیوە پان تورانیست بوون‌و هێشتاش تا رادەیەك لەژێر کاریگەری عوسمانی‌دابوون، ئەرکی پاکسازی وڵاتیان لەئەرمەنی‌و یۆنانی، پێ سپێردرا. ئەم بەرنامەیە کە بەدەستی تورکچی‌یەکی رەسەنی وەك مستەفا کەمال دەست پێ‌کرا، نەیدەتوانی بگاتە رادەی تەواوبوون ئەگەر تورکیا یەکدەست نەکرێ‌و کەمایەتی‌یەکانی غەیرە تورك (با موسلمانیش بن) (وەك کورد، لەزگی‌و چەرکەس) لەنێو نەبرێن یان لەگەڵ تورکدا یەکسان نەکرێن، لەقۆناغی یەکەمدا، کورد بوون، وەك ئەرمەن کەتەنیا گوناهی گەورەیان ئەوەبوو کەوتبوونە سەر رێگای فراوانبوونیان بەرەو رۆژهەڵات، لەروانگەی (تورکاندا، عیراقی سەربەخۆ بەناوچە کوردنشینەکانەوە «هەتا سەربەخۆش» وەك ئەرمەنستان بەتەگەرەیەکی سەرەکی سەر رێی یەکبوونی «برا هاونەژادەکانی ناو تورکیاو قەفقازو ئێران» دەژمێردرا.

پەیماننامەی نەتەوەیی کە بەردی بناغەی سیاسەتی ئەتاتورك بوو، و لەلایەن خۆی‌و هاوکارە زۆر نزیکەکانی‌یەوە دارێژرابوو، لەروانگەی ئەوانەی شارەزای زاراوەی پان تۆرانیستەکانن، زۆر رۆشنە. ئەوکاتە زاراوەی پان تورانیزم لەلایەن بێگانەکانەوە بەحەزو ئارەزووی تورکان دەگوترا کە جیهانی تورانی‌و نەژادی تورانی بەتورك دەزانن‌و یەکبوونی نێوان ئەو نەتەوانە بە «یەکێتی‌ی تورکان»و«یەکبوونی تورکان» دەزانن. لەدوابەشی ماددەی یەکەمی پەیماننامەی میللی‌دا هاتووە: «بەتەواوی ئەو ناوچانەی کە زۆربەی دانیشتوانی، موسلمانانی عوسمانین، چ لەناو خەتی ئاگربەسی لەناکاو داین‌و چ لەو دیویەوە، «ودانیشتوەکانی» هەستی رێزی یەکدی‌و قوربانی دانیان هەیەو مافە نەژادی‌و کۆمەلایەتی‌یەکانیان‌و پایەی هەر یەکەیان رێزی هەیەو ئەو یەکێتی‌یەی پێکی دێنن. بەهیچ شێوەیەك شایانی پارچە پارچە بوون‌و جوودابوونەوە نی‌یە». ئەو واژە سازی‌یە لەمەر «یەکبوونی نەتەوەیی» کە لەرووکەش‌دا بێ زیانەو لەراستی‌دا دەست پێکردنەوەی بێ‌پەردەی دروشمە بەناوبانگەکەی پان تورانیستەکانە، یەکبوونی نەژاد، زمان، ئایین‌و ئامانج.و تەواوی تورکەکان چ گەورە چ بچووك، ئەم مەسەلەیە باش دەزانن.

کاتێ رۆژنامەنووسێکی دانیشتووی ئاستانە لەبارەی رەسوولزادەو رابەرانی دیکەی ئازەری، واژەی «دوورخراوە»ی بەکارهێنا (چونکە ئەو کەسانە دوای سەرکەوتنی شۆرشی سوڤیەت لەوڵاتەکانیان پەنایان بۆ تورکیاهێنابوو)،یەکێك لەهاوکارەکانی کەمال دژی ئەو کوفرە راوەستاو گوتی: «هیچ تورکێکی ئازەری لەتورکیادا دوورخراوە نی‌یە، چونکە لەروانگەی هەر تورکێك کە ماناو واژەی (سنوور)ی نێو پەیماننامەی میللی دەرك کردبێ، هیچ جودایی‌یەك لەنێوان خاکی تورکیاو ناوچە تورك نشینەکانی دیکەدا نابینێ»؟

بەم شێوەیە، تورکیای نوێ کە خۆی بەدۆستی رووسیاسی سۆفیەت ناودەبرد، لەرۆژی رۆشن‌و بەبێ تەم‌ومژ، ئازەربایجانی سۆفیەتی بەبەشێکی جودایی هەڵنەگری خاکی تورکیا راگەیاند، خوێنەری وردبینی رۆژنامەکانی تورکیا هەموو رۆژێ دەیتوانی رای واو هەتا گوتاری دوورو درێژیش لەم بارەیەوە بخوێنێتەوە، ئەحمەد ئاغائوغلو سەرۆکی ئیدارەی گشتی چاپەمەنی تورکیا نە تەنیا بلاوکردنەوەی گوتاری وای قەدەغەنەدەکرد، بەڵکو خۆیشی لە دەربڕینی شتی گرنگترو ئاشکراتر خۆی نەدەپاراست .

ئاقاییف ئەو کەسایەتی‌یەی پێشتر لێی دواین‌و ئێستا نوێنەری ئەنجوومەنی گەورەی میللی‌و سەرنوسەری رۆژنامەی «حاکمیەتی میللی»یە، دەڵێ: ئەنقەرە لەم رووەوە ناسیونالیستە کە بەرزەفری‌یەکانی ئیمپراتۆری پێشینی عوسمانی بەرەڵلاکردووەو پێك هێنانی دەولەتێکی میللی لەسنووری نەتەوەیی - نەژادی کردۆتە ئامانجی خۆ... وئارەزووی وایە سەربەخۆیی خۆی بخاتە خزمەتی بنیاتنانەوەی ولاتی تورك..».

ئاگاداری ئەو «سنووری نەژادی»یەشین کە ئاقاییف ئاماژەی بو دەکا، لەلایەکی دیکەوە دەزانین ئەو (نیشتمانی تورك)ەی دەیەوی پێکی بهێنێ، هەمان ئیمپراتۆری هسیونگ - نون‌و ئۆردووی زێرینە. لەم لایەنەوە نە تەنیا ئەنقەرە بەڵکو سەرانسەری تورکیا ناسیونالیستە. سەرگوتارنووسی «حاکمیەتی میللی» سەبارەت بەدوا کۆنگرەی «تورك ئوجاق»ەکان نووسی: «بزافی تورکچێتی سەرانسەری ولاتی تورکیای گرتۆتەوە».

ئەدەبیاتی هاوچەرخ، رۆژنامەکان، زاراوەکانی زمان، گۆرانی فۆلکلۆری تورکی پراوپڕی گیانی تورانی‌یە. نەوەی نوێ، شیعرەکانی محەمدامین، چیرۆکەکانی خالیدە ئەدیب، نووسینەکانی یعقوب قەدری‌و ئەوانی‌تر بەپەرۆشەوە دەخوێنێتەوەو بەتورکی‌یەکی سادەو رەسەن‌و دورر لەوشەی بێگانە دەنووسێ. تۆژینەوەی تورکناسی فوئادبەگی کوپەرلوزادە، گوتارە فەلسەفی‌و سۆسیۆلۆژی‌یەکانی ضیاء گوك ئەلپ‌و ئەوانی‌دیکە خرۆشێکی زۆر دەوروژێنن، چینی رۆشنبیری تورکیا بەرووکەش هەموو پەیوەندی‌یەکانی خۆیان لەگەڵ رابردووی نزیك کە هێشتا «عوسمانلی‌و ئیسلامی» ناودەبرا، بریوە، لەمەڕ ئەدەبیاتی ئەم سەردەمە کە بۆ هەمیشە بەسەرچووە بێزاری دەردەبڕێ‌و بە «ئەدەبێکی لەززەت مگێزو تەنبەڵی ناودەبا کە دەوروبەرێکی ناتەمیزو پڕ لەهەڵچوونی دەستکرد»ی هێنابوو ەکایەوە.

ئەدەبیاتی نوێ لەدەشتە فراوانەکان‌و شاخە بەرزەکانی دنیای ئورال ئالتایی، لەژیانی بێ فڕوفێڵی قارەمانە بیابان بڕەکانی تورانی کۆن، لەهێزی بێ راددەی جەستەیی، لەگیانی پڕ جۆش‌و خرۆش‌و توانای ویستیان کە وەك «ژنێ کەمان دەکشێ» تەقدیر دەکار لەدوایی‌دا ناوی شەڕو دواسەرکەوتنەکان دەبا.

ئەدەبیاتی ناوبراو لەسەرانسەری «دنیای تورك»دا پەخش دەبێ: تا قازان، تاشقەندو سەمەرقەند کە خوازیاری زۆری هەیە، دەگا، بەتایبەتی لەبوخارا کە ئەنجومەنی رۆشنبیری تورکیا لەماوەی دە ساڵی دوایی‌دا پێشکەوتنێکی درەوشاوەی بەخۆیەوە دیوە. بەگوتەی ئەیاز ئیسحاقی «بلاوکراوەی تورك یوردو وەرگێری بیروباوەرو لەهەمان کاتدا، مولکی تەواوی جیهانی تورکە».

حمدالله صبحی بەزاراوەی شاعیرانەی «کاروان ئامانجەکان هەمیشە بەرەو ولاتانی تورك

زمان دەبا» هەروەك دوێنێ وێنەی تزارو ئەمڕۆ وێنەکانی لینین کۆلێتی مۆزێکانی رووس دەرازێننەوە، وێنەی مستەفا کەمال لەمالی هەر تۆرانی‌یەکی دانیشتووی سوفیەتدا دەبینرێ‌و ئەوەندەی ڕێز لێ دەگیرێ کە لێپرسراوانی سوفیەت بەمەبەستی ڕێگا لێ‌گرتنی، سزای قورسیان داناوە. دەستە دەستە نە تەنیا لە تورکستانی رووسەوە بەڵکو لە تورکستانی چینیش دەچنە تورکیاو پان تورانیستەکانی تورکیا گەلێك کەونە شاگردی خۆیان لەنێو ئەواندا دەبینن، ژمارەی ئەو لاوانەی بۆ خوێندن دەچوونە ئەستەمبوول، زۆرەو لەساڵانی دواییدا زۆرتریش بووە، ئەوان نەتەنیا لە زانکۆی ئەستەمبۆلدا، بەڵکو لە خوێندنگاکانی ئەنقەرە، ئەزمیرو تەرابزووندا دەخوێنن. سەدان مامۆستای تورك لەخوێندنگاکانی قەفقاز، تورکستان، تەتارستانی سەروودا دەرس دەڵێنەوە. لەبەرەکەتی دۆستایەتی تورکیاو رووسیا، سوفیەت بەئاسانی مۆڵەتی هاتن بەپان تورانیستەکان دەدا. لەشوباتی ١٩٢٦دا کۆنگرەی «تورکناسی» کە لەباکۆ پێك هاتو(٩٨) نوێنەری تورك‌و تەتار بەشداربوون (ژمارەی هەموو بەشداران ١٣١ کەس بوو)، دووکەس لەرێبەرە بەنێوبانگەکانی پان تورانیزم سەرۆکایەتی نوێنەرانی تورکیایان دەکرد: عەلی بەگی حسین زادەو فوئاد بەگ کوپەرلوزادە کە ئەوەی دوایی بۆ سەرۆکایەتی کۆنگرە هەڵبژێردرا.

چاپەمەنی‌یەکانی تورکیا لە ڕۆژنامەو گۆفار مافی هاتنە ناوەوەی رووسیای سوفیەتیان هەیەو لەبەرەکەتی پروپاگەندەی ڕۆشنبیریی بەردەوام، نەتەوە تورانی‌یەکان سروودە میللی‌یەکانی تورکیا دەڵێنەوەو بەشانازی بەخۆکردنەوە بەزمانی تورکیی ئەستەمبۆلی قسان دەکەن (...) موحەممەد ئەمین بەشاعیری میللی تەواوی تورکانی دنیا دەژمێردرێ. شیعرەکانی پایەیەکی گرنگیان لەنێو کتێبە دەرسی‌یەکاندا هەیە. دەنگدانەوەی شیعری «ئەی تورك هەستە لەخەو»ی ئەو لەهەموو شوێنێکدا دەبیسترێ:

هەستن لەخەو ئەی برایان
بەدەستی ئێوەیە کە ژیانی دنیای تورك بەردەدا
هەموو مێشەنگوینەکان تەنیا یەك هەنگەلانیان هەیە
هەموو تورکەکانیش دەبێ تەنیا یەك (توران)یان هەبێ
لەئالتایی سەرکەوە
نەعرەتەیەکی دڕندانە لەدڵتەوە دەربێنە
لەرێگای شۆرش
کاتێ گولەکان دەپشکوون کە خوێناوی بن
لەهەموو رۆڵەکانت
بارەرو خوێن‌و ئازایەتیت بوێ
تا لەژێر ئالاکەتدا خڕببنەوە
تەواوی تورکانی دنیا

خاتوو جورج گولیس، نووسەرێکە تورکانو مەیل‌و ئارەزووەکانیان بەباشی دەناسێ، لە کتێبەکەیدا بەناوی «تورکیای نوێ» لەو هۆکارە دەکۆڵێتەوە کە سەرکەوتنی مستەفا کەمالی دابین کردووە. وەفاداری دنیای تورك‌و مەغۆل، ئەم سەرچاوە بێ رادەیەی

مرزفایەتی، فیداکاری بە پەرۆشی ئەم سەربازە ئامادانەی قوربانی کە کەمال توانی لەوان هۆکاری سەرەکی سەرکەوتنی خۆی دروست بکاو بەکاری بهێنێ.

پێشرەوانی پان تورانیزم؛ حمدالله صبحی، ئاقایێف‌وئەوانە دیکە، کاتێ رێگایان کردەوەو لەنێو گرووپە جۆربەجۆرەکانی تۆرانی‌دا یەکەمین پەیوەندی‌یان دروست کرد، باوەڕیان نەدەکرد پروپاگندەیان تا ئەو شوێنە دوورانە بڕواو وا بەزوویی کاریگەربێ. نووسەر تەئکید دەکا کە بەبێ بەشداری ئەم نەتەوانە ـ کە زنجیرە گرووپێکی نەژادی برا لەقەفقازەوە بگرە تا سنوورەکانی چین پێك دێنن ـ تەتەرەکانی قرم، موسلمانانی قەفقاز، بوخاراو خیوەو سەمەرقەند ـ مستەفا کەمال نەیدەتوانی ئەم دەسەڵاتو خۆشەویستی‌یە وەدەست بهێنێ کە بتوانێ لەبەرامبەر ئینگلستانو رووسیادا رابوەستێ. ئەوەدەم لەساڵی ۱۹۲۰ کە تازە دەسەڵاتی کەمال لەئەنقەرە جێگیربووبوو، خۆی بەقارەمانی یەکبوونی ئەم نەتەوە جۆر بەجۆرانە دەژمارد، دەستەی نوێنەرایەتی‌یەکانیانی بەرێو رەسمێکی تەواوەوە پێشوازی دەکردو باشترین ئەفسەری خۆی دەخستە خزمەتیان، بێجگە لەوەش، ئەنوەر پاشا پەیوەست‌کردنی تورکستانی بەئەستۆوە گرتبوو، ژمارەیەکی گەلێ زۆر لە رۆشنبیرو ئەفسەرانی تورك بەردەوام رووەو جیهانە بەرفراوانەکەی وەرێ دەکەوتن‌و دەستەی چالاکی‌یان پێك دێنا.

خاتوو جۆرج گولیس توێژینەوەکەی بەسووربوون لەتایبەتمەندی دوولایەنەی پەیوەندی‌یەکانی تورکیاو سۆڤیەت تەواودەکا، لەبارێکدا هێزە نێردراوەکانی رووس پلە بە پلە لەدەشتەکانی ئاسیای ناوەڕاستدا دەتوێنەوە؛ رێکەوتننامەی یەك لەدوای یەك لەنێوان مۆسکۆو ئەنقەرەدا مۆردەکرێن؛ هەردوو دەوڵەت وا لەخۆیان دەکەن دەڵێی هەر ئاگاشیان لەو عەمەلیاتە بەردەوامانە نی‌یە؛

راستە تورکیا بەیارمەتی رووسیای سۆڤیەت توانی دەسەڵاتی لەدەست‌چووی خۆی وەدەست بهێنێتەوە، راستە یەکێك لەمەبەستە سەرەکی‌یەکانی رووس لەم کارە ـ رەنگە مەبەستی بنچینەیی ـ جلەوگرتنی مارە حەفت سەرەکەی پان تۆرانیزم بێ کە لەخەو هەڵدەستاو لەنێو دەروونی سنووری وڵاتەکانیان رژێمی تازەی دەخستنە لەرزین، ئەم مەسەلەیە ئەوەندە سرنجی ئێمەی رانەکێشاوەو جێگای خۆیەتی باسێکی لێوەبکەین.

سرنج راکێش‌ترین رووداوی عەسکەری کە نووسەر پەنجەی بۆ راکێشاوە، شۆرشێکە لەساڵی ۱۹۲۲ لەتورکستان دەستی پێ کردو بەزوویی سەرکوت کرا. لە لاپەرەکانی هەوەڵدا، باسمان کرد کە چۆن بەلشەفیکەکان کە لەساڵی ۱۹۱۸ بەلەشکری سۆرو ئابلوقەی عەسکەری توانیان شۆرشی فەرغان ( یان کودێتا بەپێی ئەو مەرجانەی هەڵدەبژێدرێ) سەرکوت‌بکەنو دەسەڵاتی سوڤیەتەکان جێگیربکەن، بەڵام مەسەلەکە بەتەواوی چارەسەر نەکرابوو. قەرغیزو ئۆزبەکە لاوەکان کە زۆربەیان لایەنگرانی سەربەخۆیی‌و هەتا یەکێتی لەگەڵ تورکیابوون، پەنایان وەبەر چیاکان بردو بزاڤەکەیان بەردەوام بوو. کارمەندانی تورکو ئازەر کۆمەکیان دەکردنو چەکو پارەیان دەدایە ئەو چیانشینانە کە (باسماچی)یان پێ دەگوترا، هەڵمەتی کتوپڕو تۆڵەستاندنو هێرش کردنەسەر یەکدی بێ پسانەوە بەردەوام بوو.

لە نیسانی ۱۹۲۲دا، ئەنوەر پاشا کە لە ئەنجامی چالاکی‌یە بەردەوامەکانی‌دا،

«حزبی تورکی‌ی سۆفیەتی‌ی میللی» لە مۆسکو دامەزراندو بە گاڵتەجاری‌و خۆ بە کۆمۆنیست نیشان دان توانیبووی متمانەی بەلشەفیکەکان وەربگرێ، بەکاری ناوبژی نێوان سوفیەت‌و یاخی‌یەکان لەلایەن کۆمیتەی راپەراندنی ناوەندی مۆسکۆوە بۆ تورکستان نێردرا. بەڵام ئەگەر گەیشتە تاشقەند بووە سەرۆکی یاخی‌یەکان‌و سەرکردایەتی هێزە عەسکەری‌یە هاوبەشەکانی تورکستان‌و بوخاراو خیوەی بەئەستۆوە گرت‌و نازناوی «ئەمیر»ی پێدرا. دوای مانگێك لەرێگای باکۆ یان وردتر بڵێین بەهۆی نەریمانۆڤی سەرۆك کۆمیتەی سوفیەتی میللی ئازەربایجانەوە پەیامێکی بۆ مۆسکۆ نارد کە پوختەکەی ئەمەبوو: «بەمن سپێردراوە، ویستی خەڵکی بوخاراو تورکستان لە بەئازادی‌و سەربەخۆژیان بەئێوە رابگەیەنم، شورا داواکارە:

أ. سەربەخۆیی ئەم وڵاتانە بەرەسمی بناسرێ.

ب. یەکەکانی لەشکری سۆرو ئۆرگانەکانی حکومەتی بەلشەفیك لەماوەی دوو حەفتەدا ناوچەی ناوبراو چۆڵ بکەن، ئەگەر خواستەکانی ئەو نەتەوە موسلمانانەی کە لەژێر کۆتی بێزراوی کۆمیسەرە داگیرکەرەکاندا وردوخاش بوونە، لەبەرچاو نەگیرێ، ئەوان بۆ رزگاری وڵاتەکەیان لەژێر دەستی مۆسکۆ، دەست دەدەنە چەك»

راگەیەندراوەکە بەم ئاگادارکردنەوەیە کۆتایی دەهات کە دوو هەفتە دوای دەرچوونی، نووسەرەکەی لەلایەکەوە کاری خۆی پارێزراو دەزانی‌و لەلایەکی دیکەوە ئەو ئەرکەی پێش مانگێك پێی سپێردرابوو، رەت دەکردەوە، و راگەیەنراوەکەشی بەم نێوە مۆرکردبوو: ئەنوەر، فەرماندەی گشتی هێزەکانی بوخاراو خیوەو تورکستان».

تەنیا چەند مانگێك بەس بوو تا لەشکری سۆر جارێکی دیکە تورکستان بگرێتەوەو ئەنوەر ببێتە قوربانی گوللەیەکی بەلشەفیك‌و بکوژرێ. ئەمما فایلی جودایی‌خوازی ئاسیای ناوەڕاست بەتەواوی نەبەسترا. سامی بەگ، جنیدخان‌و کەسانی دی جێگای ئەنوەریان گرتەوە، ناسیونالیستە پان تورانیستەکانی تورکستان کە بە نهێنی لەوێ دەژیان، کاروپروپاگەندەی خۆیان درێژە پێدەدا، هەتا لە وڵاتانی تورك نشینی ژێر دەسەڵاتی سۆفیەتی‌ی حکومەتەکان‌و حزبە کۆمۆنیستەکان، خۆیان بە قارەمانی ماف‌و خواستە میللی‌یەکان دەژمارد، بەشکایەت‌و داواکاری بەردەوام بۆ کۆنگرەکانی سەرانسەری روسیا، توانیان جودایی چەند ناوچەیەك کە تازە لە ئوزبەکستان‌و تاجیکستان دامەزرابوون، لە کۆماری رووسیای سوسیالیستی فیدرالی، واتە روسیا، مسۆگەر بکەن‌و پاشان لکاندنی راستەوخۆیان بە یەکێتی‌ی سۆفیەت بەمافی یەکسان لەگەڵ رووسیا، بیلورووسیا، ئوکراین‌و ئەودیوی قەفقاز، دابین بکەن.

نەتەوە تورانی‌یەکانی سۆفیەت ـ قۆزاق، قەرغیز، قەرەقالپاق، تاجیك(!)، قەرغیزی سەروو، قەلموق، تەتەرەکانی قەرم‌و فۆلگا، باشکیر، ئازەری‌و ئەوانی دیکە ـ کەم‌و زۆر هەمان سەربەخۆیی نێوخۆیی‌یان هەیە، بەواتایەکی تر، ئێمە خۆمان لەبەرامبەر چواردە پازدە «تورکیای گچکە»دا دەبینینەوە. کۆمەڵێکی پێکهاتوو لەنەتەوەی هاوخوێن‌و هاودین‌و لەئایندەدا قابیلی یەکبوون، بەگوتەی نووسەرێکی دی شارەزای ئەم بابەتە: (تورانیان تا نەتەوە زۆر دوورەکانی یاقووت، زیریان، فیتاك، چەرمیس، زمانی میللی کەونی خۆیان دەدۆزنەوەو خەونی ئازادی‌و یەکبوون لەگەڵ برایانی تاشقەندی، قازانی‌و

ئەنقەرەییەکانییان دەبینن»؟

دوورڤ دەبین ئەگەر جارێکی دیکە بە کتێبەکەی خاتوو جورج گولیس‌دا بچینەوە کە دوای دیاری‌کردنی نەخشی ڕەگەزی تورانی لەدوا پێشکەوتنەکانی تورکیای میللی‌دا، خاڵێکی سرنج ڕاکێش وەبیردێنیتەوە. لەڕوانگەی ئەودا، قەفقازو ئاسیای ناوەڕاست بەناوچەیەکی فراوان دەژمێردرێ کە تورکان دەیانەوێ بیگرن‌و قەت واز لەو مەبەستە ناهێنن کە بەناچاری، ئەوان بۆ بنیاتنانەوەی ئیمپراتۆری عوسمانی بەشێوەیەکی تەواوجودا، هان دەدا.

خاتوو جورج گولیس ئەم بەرنامەیە بە «هێژاترین‌و پیرۆزترین» ئارەزووی تورکان دەزانێ. ئەم بەمسۆگەری دەزانێ کە ئەم کونفیدراسیۆنە گەورەیەی تورک‌و تەتەرو مەغۆڵ کە لە ئەنقەرەوە دەست پێدەکا (پایەیەکی ستراتیژی زۆر بەنرخ) لەڕوانگەی گەلەك کادیری ڕۆشنبیرو عەسکەری تورکدا، بە چڵەپۆپەی سەرکەوتنی مسۆگەر دەژمێردرێ. دەبێ ئەوەشی بۆ زیادبکەین ڕێبازی وا دەرەنجامێکی وای دەبێ کە گرنگترینیان شەڕ لەگەڵ ڕووسیایەو ئەمەش تورکان ناترسێنێ. ئەوان دڵنیان کە لەڕۆژانی شەڕی یەکەمی جیهانی‌دا کات لەقازانجی ئەوان دابوو، و هێشتاش هەروایە، نەتەوە ناوبراوەکان بە ئەسپی تەروادەی تورکان، لەپشتەوەی دوژمن دەژمێردرێن‌و پان تورانیزم لەپێشکەوتن دایە[6].

پان تورانیزم وەك ئامانج، مەیل‌و بەرنامە لەڕوانگەی تورکاندا ئیدی مەسەلەیەکی پەیوەست بە تیوری‌و ڕێ‌و شوێن نی‌یە، تورکانی عوسمانی‌و «ئیردنتا» ئامانجی یەکبوونی تورکانی بێ ئەم لاوئەولا قبووڵ کردووەو جێبەجێ کردووە، هەتا جارێك توانیویانە بەشێك لەبەرنامەکەیان پراکتیزەبکەن‌و ئەوەش ئەو دەمە بوو کە باکۆیان گرت‌و لەوێوە بەرەو ئازەربایجانی ئێران لەخوارێ‌و داغستان لەسەرێ، ڕۆیشتن‌و هیچ مەعلوومیش نی‌یە کە ئەگەر ڕۆژێ دووبارە هەلێك برەخسێ، ئەم کارە دووبارە نەکەنەوە.

ئێستا ڕێبەرانی تورکیا دەربارەی مەسەلەکان‌و شێوەی جێبەجێ‌کرانی بەرنامەو ئەو شێوە تایبەتی‌یەی دەبێ بەو یەکێتی‌یە بدرێ، گفتوگۆ دەکەن، بنەمای سیاسی تورکیای گەورە چۆن دەبێ؟ لەم بارەیەوە، ئەوان دەبنە دوو دەستە، تورانیانی (ئیردنتا) حەزدەکەن بەشێوەی فیدرالی بەوڵاتی دایکیانەوە پەیوەستن بن، لەبارێکدا تورکانی تورکیا بەڵانی کەمەوە لەمەڕ ئوغوزەکان، خوازیاری لکاندنی بێ‌کۆت‌و بەندن، هەڵبەت لەخودی تورکیادا کەسانێکی کەمێك واقیع بین هەن کە ڕێگاچارەی فیدراڵ بەچاك دەزانن، هەروەك لەنێو تورانیانی ڕووسیادا توندڕەوی وا هەن کە لایەنگری لکاندنی بێ کۆت‌و بەندن، ڕوانگەی دوایی لەلایەن حزبی «بیوك تورکیاو ئیتیحادی ئیسلام» کە لەساڵی ١٩١٧ لە ئازەربێجانی قەفقازدا پێك هاتووە، پشتیوانی لێدەکرا، بەڵام حزبی ناوبراو بەکەمایەتی مایەوە، هەروەك فیدرالیستەکانی تورکیاش کەمایەتین.

لەبەرهەندێ خەتێکی جوداکەرەوە، تورکانی تورکیاو تورکانی دەرەوەی ئەو وڵاتە لێك جودادەکاتەوە، دەستەی یەکەم لایەنگری یەکبوونن بەپێی کۆبوونەوە (مەرکەزی وەحدەتچی)و دەستەی دووەم لایەنگری یەکبوونن بەپێی خر نەبوونەوە (عەدەم تەمەرکزی وەحدەتچی).

بەشێك لەسیاسەتمەدارانی تورکیا ئەوەندە لەتێزەکانی (عەدەم تەمەرکوز) ناراحەت

دەبن کە هەتا گومان لە راستگۆیی کەونە تێکۆشەرانی پان تورانیزم دەکەنو ئەوان بەبوونی (مەیلی جوداخوازی)و (سەربەخۆیی خوازی) تاوانبار دەکەن.

لەم بارەیەوە مشتومڕێکی توند لەکانوونی دووەمی ١٩٢٦دا لەرۆژنامەی (وەقت)ی ئەستامبۆلی دەستی پێکرد. لەلایەك (عەلی حەیدەر ئەمیر بەگ) نووسەری سیاسی تورکو لەلایەکی دیکە (ئەیاز ئیسحاقی) ڕێبەری تەتەرەکانی سەرروو،و موحەمەد ئەمین رەسولزادەی ڕێبەری ئازەری حزبی (موساوات)، بەشداربوون. لەمیانەی ئەم باسەدا ئەیاز ئیسحاقی بەراشکاوی رایگەیاند: «تورکانی دەرەوە هیچ کاتێ مەیلی یەکبوونی بەبێ تورکیایان نەبووە، تەتەرەکانی سەرروو قەت ئارەزوویان نەبووە یەکەیەکی سیاسیی سەربەخۆ لەدەوروبەری (قازان) پێك بهێنن، هەروەها تورکستان حەزی لێنەبووە لە دەوروبەری بوخاراو، قرم لەدەوروبەری باغچە سەرایو، ئازەربایجان لەدەوروبەری باکۆ یەکەی سەربەخۆیان هەبێ، ئەم بنکە جۆراوجۆرانە هەمیشە خۆیان بەلکی درەختی گەورەی تورك زانیوە،بیری پێچەوانەی ئەم تیورییە جگە لە درۆ شتێکی دیکە نییەو بەهاندانی دژایەتی پان تورانیزم کە بەگشتی لەراستییەکانی ئێمە بێگانەن، شێوێنراوە»٧.

دەربارەی ئارەزووەکانی خەلکی تورکستانو تەتەرستانی سەرروو زانیارییەکی وردمان بەدەستەوە نییە، بەلام لەمەڕ ئازەربایجانی قەفقاز ئەو راستییە دەزانین: ئەوان یەکەمین نەتەوەی تورانی رووسیای سوفیەت بوون کە خۆیان بەقارەمانی پان تورانیزم لەتەك تورکیا، دانا. بەم شێوەیە، پەیوەندی تورکیاو ئازەربایجانی قەفقاز بابەتی سەرەکی ئەم مشتومڕە رۆژنامەنووسییە بوو.

لە ٣١ی کانوونی یەکەمی ١٩٢٥ عەلی حەیدەر بەگ ئەممەسەلەیەی خستەڕوو کە کەوتنی یەکجارەکی ئازەربایجانی سەربەخۆ لەبەرئەوەبوو،ئەو ولاتە، لکاندنی خۆی بەتورکیا، قبوول نەکرد. رەسولزادە وەك ڕێبەری بەهێزترین حزبی سیاسی ئازەربایجان بێ درەنگ وەلامی داوەو درووشمی خۆی دووبارە کردەوە: حزبی دیموکراتی ـ لیبرالی موساوات لایەنگری یەکبوونی نەتەوە تورك نەژادەکانو لایەنگری یەکێتییە لەگەل تورکیا، بەلام ناوەندێتی قبوول ناکاو فیدرالیستە،حزبی موساوات بەهۆی هەلوێستە سیاسییەکانیەوە واقیع بینە، نە خەیال پەرست»٨.

پوختەیەکی ئەو تێزانەی لەم مشتومڕە رۆژنامەنووسییەدا خرابوونەڕوو، بەم شێوەیە بوون:

رۆشنبیری تورك رەخنە لەئوسولی فیدرالیزمو سەربەخۆیی دەگرێ کە حزبی موساوات پەسندی دەکاو دەلێ فۆرمۆلەی فیدرالیزم زۆر فراوانەو ناڕۆشنیشە، هەروەك دوێنێ ئازەربایجان لەگەل گورجستانو ئەرمەنستان فیدراسیۆنێکی پێك هێناو دیویکی بەناوی «کۆنفیدراسیۆنی ئەودیوی قەفقاز» دژی ئێمە راست کردەوە، دەتوانێ سبەینێ لەگەل رووسیا یان ئێران فیدراسیۆنێك پێك بهێنێو ئەم گەمەیە دووبارە بکاتەوە. فیدراسیۆن شتێکی باشە، بەلام لەگەل کێ؟ لەگەل جورجیانی مەنشەفیکو ئەرمەنە داشناکەکان؟ ئێوە چۆن دەتوانن لەگەل ئەرمەندا یەکبگرن کە هێشتا خوێنی ١١٠٠٠ یازدە هەزار تورك کە لەماوەی سێ مانگدا لە باکۆو یەریفانو قارسدا کوژراون، هیشك نەبووە؟».

ئەودەم عەلی حەیدەر بەگ مەسەلەیەکی پراکتیکی، دەخاتە بەردەم

ئازەربایجانی‌یەکانو دەڵێ: «ئەو قازانجە سیاسیو ئابووری‌یانەی کە ئێوە دەتانەوێ لە ڕێگای کۆنفدراسیۆنێکی واوە وەدەست بخەن، چی‌یە؟» وەڵامێکی ڕاستو ڕەوانی پرسیارەکەی خۆی دەداتەوە.

«دوای ئەوەی ئازەربایجانی یەکگرتووی جورجستانو ئەرمەنستان لە ڕاپەرینی دژی رووسەکاندا یارمەتی دان، ئەگەر شەڕێك لەنێوان تورکیاو ئەو دوو وڵاتەدا بقەومێ، چ ڕێرەوێك دەگرێتەبەر؟ هەڵوێستی ئازەربایجانی یەکگرتووی ئەرمەنستان کە دوژمنی تورکیایە، لەدنیای تورکدا، چی دەبێ؟

عەلی حەیدەر بەگ نارازی پرانسیپی سەربەخۆیی ئازەربایجانیشەو ئازەرەکان بەوە تاوانبار دەکا کە نەتەنیا ئارەزووی ئەوەیان هەیە لەرووسیا جودابنەوە، بەڵکوو دەیانەوێ لەتورکیاش سەربەخۆبن، ئەگەرنا خۆیان دروشمی «جودایی لەرووسیا، یەکبوون لەگەڵ تورکیا»یان جێبەجێ دەکرد.

لەدوایی‌دا ئایا ئەوان تورکی واقیعین یان نا؟ دەڵێ: «ئێوە ئارەزووی بوونی ئازەربایجانێکی سەربەخۆتان هەیە کە لەشکر، هێزی دەریایی، ئاڵای نیشتمانی، وەزارەتی دەرەوەو دارایی خۆی هەبێو یەکگرتووی تورکیاش بێ، بەڵام تورك ئیدیعای وا قبووڵ ناکەن.

«کاتێ تورکچی‌یەکانی تورکیا لەمەڕ یەکێتی‌یەوە گفتوگۆ دەکەن، مسۆگەر خەونی ئەوە نابینن کە نۆ نەتەوەی تورك نەژاد لەیەك جێگادا لەدامەنی یەك دەوڵەتدا یەك بگرنو مێژووی جوداو دووری‌یە جوگرافی‌یەکەیان رەش بکەنەوە، لەهەمان کاتدا، ئامادەنین، دامەزرانی دەوڵەتانی تورك لەتەنیشت سنوورەکانیان ببینن‌و تەنیا بەیەکێتی رازی بن، دروشمی ئێمە یەکبوونی زمانو یەکبوونی خاکە».

ڕەسولزادە لەگوتارەکەیدا نووسی: هیچ کەس لە ئازەربایجان لە دژی یەکێتی نی‌یە لەگەڵ تورکیاو دروشمی سەربەخۆیی تەنیا لەنارەزایی‌یە دژی روسیا نەك تورکیا، ئەو بەتەئکیدکردن لەواقیعیەتی بەڵگەنەویست، بەهێنانەوەی بەڵگە دەیەوێ تیوری‌یەکەی جێگیربکا، ئەو دەڵێ ئەو بەڵگانە نەتەنیا باوەڕی شەخسی ئەون، بەڵکوو ڕێوشوێنی بیروباوەڕو ئامانجە سیاسی‌یەکانی گرووپێکی سیاسی وڵاتەکەی دەردەبڕن، بۆیە دەبێ بەهەمان شێوە قبووڵ بکرێن، یان بە تەواوی ڕەت بکرێنەوە.

****

«پرانسیپی بیروباوەڕو ئامانجە سیاسی‌یەکانی گرووپێکی دیاریکراو (واتە حزبی موساوات) کامانەن؟ ڕەسولزادە لەچەند جێگایەکدا روو لە حەیدەر بەگ دەکار تەئکید دەکا کە ڕێو شوێنی ناوبراو «یەکێتی لەگەڵ تورکیا دەگرێتەوە، بەڵام لەسەر بنچینەی (عەدەم تەمەرکوز)»، ئەو گلەیی دەکا کە حەیدەر بەگ واقیعیەتی مێژوویی‌و هەلومەرجی ڕاستەقینەی مێژوویی لەبەرچاو ناگرێ، بەرپرس نی‌یە، خەیاڵ پەروەرو پەرشو بڵاوی فیکری دینێتە کایەوە، ڕێبەری موساوات دەڵێ. «لەدنیای سیاسەتدا ئێمە زۆرتر پەیوەندیمان بە واقیعیەتەوە هەیە نەك هەڵگرتنی بیروباوەڕی خەیاڵ پەرەستانە»٥.

کۆنە تێکۆشەری پان تورانیزم لەو باوەڕەدا نی‌یە کۆنفدراسیۆنێکی وا لەو دیوی قەفقازدا بتوانی بەوەدی هێنانی فیدراسیۆنی نەتەوە تورك نەژادەکان کە گەورەترین

ئامانجی ژیانی بووە، زیان بگەیەنێ. بە پێچەوانەوە، دەتوانێ هێزێکی پشتیوانی کاتی، بەلاّم زۆر بەسوود لەرێی گەیشتن بە ئامانج و بەرنامەکانی تورکاندابێ، بەهەرحاڵ، بوونی ئازەربێجان لە کۆنفەدراسیۆنی ئەودیوی قەفقازدا زامنێك دەبێ بۆ تورکیا کە کۆنفیدراسیۆنیناوبراو هەرگیز دژی تورکیا کارێك ناکا.

سیاسەتمەداری ئازەر لە جێگایەکی دیکەدا دەڵێ: «لەبەرئەوەی کۆنفەدراسیۆنی ناوبراو لەرابردوودا جارێك رێگری یەکێتی بووە لەگەڵ تورکیا، ناکرێ لەمەوە ئەوە هەڵێنجین کە لەئایندەشدا بەناچاری بارێکی وا دووبارە دەبێتەوە. بڕگەیەك لەیەکێك لە گوتارەکانی خۆی دەنووسێتەوە:

«بەدیتنی ئەو جۆش و خرۆشە مەزنەی کە ئەمڕۆ ژیانی میللی تورکیا لێرەو لەوێ بەخۆیەوە دەبینێ. ناکرێ ئەو باوەڕە قبووڵ نەکرێ کە سەرباری هەبوونی چەندان جۆرە تەگەرە، سەرەنجام رۆژی ئەم جۆگانە تێك دەکەنەوەو رووبارێك لە فیدراسیۆنێکی بەهێز پێك دێنن، هەروەك چۆن دەولەتە زۆر گچکەو پەڕاگەندەکانی ئەلمانیا لەساڵی ١٨٧١دا یەکیان گرت و هێزێکی عەسکەری، بازرگانی و زانستی و رۆشنبیری پلە یەکیان هێنا کایەوە.

بۆ گەیشتنە ئەم ئامانجدارییە، دنیای تورك دەبێ قۆناغی جۆراوجۆر ببوێرێ و یەکێتی بە میللەتانی قەفقاز دژی دەستەلاّتی رووسیا، رێك یەکێك لەو قوناغانە بێ»[٨]

رەسوولزادە، گوتارەکەی بەمە کۆتایی دێنێ کە ئەو واقیعبینییە سیاسییەی کەدەربارەی گفتوگۆ دەکا، تاکتیکە نە ستراتیژ، چونکە خۆی بەمەبەستی بلاّوکردنەوەی بیروباوەڕی پانتورانیستی بەنێو نەوەی نوێدا، بەرهەمی «خەیاڵی» بلاّودەکاتەوە.

ئەگەرچی عەلی حەیدەر بەگ بەتووندی دژی فیکری فیدراسیۆنەو تێدەکۆشێ، بێ نرخی بکار، بۆئەوەی ئازەرەکان بترسێنێ، تاوانباریان دەکا بەوەی هێشتا فیکری یەکێتییان لەگەل ئوردووی بەرامبەر ـ ئەرمەنستان و گورجستان ـ لەمێشك دایە، بەلاّم لەهەمان کاتدا، تاکتیکی واقیع بینانەو پێشکەوتنی قوناغ بە قۆناغ قبووڵ دەکاو دەڵێ: «لەژیانی میللەتاندا، هیچ شتێك مەحاڵ نییەو زوو یان درەنگ، لەوانەیە بگەنە هەموو ئامانجەکانیان بەمەرجێك خۆیان بخەنە ژێر رێبەریی هەڵبژاردەی رۆشنبیرانی وەفادار بە پرانسیپ و ئامانجی روشن و وەك نموونە: ئیتالیا، یۆنان و پولەندا ناودەبا، ئەو میللەتانەی ئەمڕۆ بەرنامەی رزگاری خۆیان کە سەردەمێ بەخەونی شاعیرانە دادەنرا، وەدی هێناوە. ئەو درێژەی پێ دەدا: «دەبێ جودایی لەنێوان خەیاڵپەروەریی میللی و خەیاڵپەروەری ئەدەبی دابنرێ، یەکەمیان، لەوانەیە نرخەکەی لەدەست دابێ، لەکاتێکدا دووەم بنچینەی نیشتمانپەروەری ئامانجدارو واقیع بینانە پێك دێنێ و مەسەلەکەش ئەوەیە لەکاتی دارشتنی بەرنامەی کار چ لەسەر ئاستی تاکەکەس و چ لەسەر ئاستی حزبی، ئامانج و قۆناغ و سەردەم بەتەواوی دیاری بکرێن و هەڵبسەنگێندرێن و بڕیاریان لێ بدرێ. لەخەباتی ژیانی میللیدا، خەڵك و لەشکرو حزبە سیاسییەکان سەرکردایەتی عەسکەری پێك دێنن. بەرنامە حزبییەکان لەنەخشەی شەڕدەچن، لەکاتی پێویستدا ستراتیژ دەشاردرێتەوەو قۆناغە دیاری کراوەکان وەك ئامانج رادەگەیەنرێن، موساوات حزبێکی تورکە کە دەتوانێ ستراتیژەکەی نەدرکێنێ و تەنیا قۆناغی یەکەمی رابگەیەنێ، لەبەر هەندێ، دەبێ تەنیا

لایەنی کەمی بەرنامەکەی داڕێژێ و ئامانجەکەی بەپێی گۆڕانکاری‌یەکانی ئەو سەردەم، دیاری بکا، ئەوەدەمە، هەوڵەکانی زۆرتر بۆ بەرنامە تەرخان دەکرێ، کارێ کە ئێمە بۆی دیاری دەکەین، بەم شێوەیە ئازەربێجانی سەروو سەرەتا سەربەخۆیی‌یەکەی زامن دەکار لەقۆناغی دواتردا لەگەڵ تورکیادا، یەك دەگرێ»؟

لەم بەڵگەنامە گرنگەدا هاتووە: «تورکەکان لەخۆیان دەپرسن، ئەگەر ئازەربێجانی‌یەکان لەمەیلی یەکگرتن لەگەڵ تورکیادا راستگۆن، بۆچی لەساڵانی ۱۹۱۷-۱۹۲۱دا ئەم کارەیان ئەنجام نەدا کە رووسیا لە قەفقاز وەدەرکەوتبوو؟» بەراستی بۆچی؟ ئێمەش دەپرسین.

رووداوەکان و هەلومەرجی مێژوویی راستەقینە تەگەرەی یەکبوونی تەواوی ئازەربێجان و تورکیا (کە بەرووکەش موساواتی‌یەکان رازی نەبوون) یان بەلایەنی کەمەوە یەکێتی فیدراڵ لەگەڵ ئەو وڵاتە بوور رەسولزادە هێمایان بۆ دەکا، چی بوون؟

لەمارەی کۆتایی ۱۹۱۷ تا کانوونی یەکەمی ۱۹۱۸ (لە تێشکانی لەشکری تزار تا هاتنی لەشکری تورك بۆ قەفقاز) ئازەربێجان لە رووی دانیشتوانەوە بەزەحمەت سێ‌یەکی کۆی دانیشتوانی قەفقازی پێك دێنا بەهۆی ئەرمەنستانەوە لەتورکیا دادەبڕێ و لەلایەکی دیکەش بەشێوەیەکی هەست پێ کراو بێ داودەزگا بوو، بێگومان نەیدەتوانی بریاری شتێکی دیکە بدا، ئازەربێجان جگە لەیەکێتی رووکەش بە میللەتانی دیکەی قەفقاز و بەناچاری بەشداری کردن لە «سێیم»ی ئەودیوی قەفقاز، چارەیەکی دیکەی نەبوو. هەموویان بەبێ جودایی لەئەرمەن و گورجی‌یەوە بگرە تا تورکەکان ئاگایان لەبارودۆخی راستەقینەی ئازەربێجانی ئەو ساڵە پڕ ئاژاوەیە بوو، و مامەڵەو کاری بن پەردەی ئەوانیش لەکەس شاردراوە نی‌یە.

ئازەرەکان بەئاشکرا یان نهێنی، هەرچی لەتوانایان دابوو بۆ شەلکردنی یەکێتی سێ میللەت کردیان، لە پشتەوە خەنجەریان لە هێزە ئەرمەنەکاندا تا ئەم «دوژمنی تورکیا»یە بەهەر شێوازێکی گونجاو لەهەر جێگایەکدا دەستیان دەبوو، لەنێوببەن. ئەگەر لەشکری «ئازادیخواز»ی تورکیا پێی نایە خاکی قەفقاز، ئازەرەکان لە «سێیم» وەدەرکەوتن و سەربەخۆیی خۆیان راگەیاند. لەگەنجە،یەکەمین دەمی پەیوەست بوون، ئیدی ئازەر و عوسمانلی نەمابوو، تەنیا یەك «تورك چولوق»و یەك لەشکری خاوەن ژەنەراڵی تورك هەبوو کە ئامانجی گرتنی باکۆو فەتحی سەرانسەری قەفقاز بوو، دەبوو سەرەتا یەکێتی تورکانی تورکیاو قەفقاز بەکردەوە زامن بکرێ و ئەو شێوەیەی پێویستە پێی بدرێ بۆ دواتر هەڵگیرا، ئەوان رۆژان، رۆژی کارو چالاکی بوو، چالاکی‌یەك‌کەلەنێو خوێن‌وئاگردا ئەنجام دەدرا.

دوای ئەوە، رۆژانی شکست گەیشت، شەر راگرتن تورکەکانی ناچارکرد بگەڕێنەوە وڵاتەکەی خۆیان و ئینگلیزە سەرکەوتووەکان لە قەفقاز جێگیربوون و بەئاشکرا مەیلی خۆیان بەخستنە ئینتیدابی ئازەربێجان راگەیاند. لەبەرهەندێ «ئازەربێجان ناچارکرا وەك وڵاتێکی سەربەخۆ بەلەشکرو وەزارەتی کاروباری دەرەوەو دارایی خۆی، بمێنێتەوە»، دەوڵەتی ناوبراو نەیدەتوانی سەربەخۆیی خۆی لەگەڵ سەروو هەروەها لەگەڵ خوارێ نەپارێزێ، ئینگلیزەکان هەر بۆ ئەمە باکۆیان داگیرکردبوو کە رێگا لەیەکێتی‌یەکی وا

بگرنو بەردەمی هاتنی تورکان بۆ ئاسیای ناوەراست بگرن. هەموو داوو دەزگا دەولەتی‌یەکان لەوەزارەتی کەرستەی خواردەمەنی‌یەوە بگرە تا دەگاتە بانکی دەولەتی، پیشەسازی نەوت، کەشتی‌گەلی بازرگانی، پۆستو تەلەگرافو تەلەفۆن، دادو پۆلیس یەکسەر کەوتە دەستی ئینگلیزەکانو نەدەکرا ئازەربێجان بە پێی مەیلی خۆی بجولێتەوە.!! ئینگلیزەکان ئازەربێجانیان بەجی هێشتو بەجی نەهێشت، رووسیای سوفیەت جێگای گرتەوەو نیمچە سەربەخۆیی‌یەکەی ئەو ولاتە کە پارێزراوبوو جارێکی دیکەش خەلتانی خوێن بوو. تێکۆشەرو سیاسەتمەدارانی تورکی رووسیا کە پێش شەری یەکەمی جیهانی خەیالپەروەری پر جۆشو خرۆش بوون، بەتایبەتی سێ سالی سەربەخۆییو دژواریو کۆتایی کارەساتەکەیان، کارامەتر بووبوون، ئێستا وازیان لەخەیال هێنابوو، و تورکانی عوسمانی‌یان بۆ گرتنەبەری سیاسەتێکی واقیع‌بینانە هان دەدا. ئەوان بەمسۆگەری تێ گەیشتبوون ئازەربێجان بەتەنیاو بێ‌ئەوەی لەگەڵ میللەتانی دیکەی قەفقاز یەك بگرێ، ناتوانێ خۆی لەدەستەلاتی رووسەکان رزگاربکا، بۆیە، بەتورکانیان دەگوت سەبر بگرنو فروفێل بەکاربهێنن. ئازەرەکان نەتەنیا حەزیان نەدەکرد بە هیچ شێوەیەك لەگەڵ گورجیو ئەرمەنان کە هەموو شتێکیان لە نەژادەوە بگرە تا ئایین لێکجودابوو، پێکەوە بژین، نەتەنیا یەکێتی لەگەڵ تورکیای عوسمانی هێژاترین ئارەزوویان بوو، بەلکو سەرکەوتنی بەرنامەی پان تورانیستی لەلای ئەواندا، لەهەموو شتێ بایەخدارتربوو، تەنیا فیدراسیۆنێکی بەهێزی پان تورانیست لەدەریای ناوەراستەوە تا ئۆرالو بالخاش دەیتوانی دیوارێکی مکوومی بەردەمی هاتنەخوارەوەی رووسەکان بێو ئازادی ئازەربابێجان زامن بکا، فیدراسیۆنی ناوبراو کە تورکیاو دوو ئازەربێجان ، تورکمانستانو ئۆزبەکستانو ناوچە تورك نشینەکانی دیکەی دەگرتەخۆ، هیچ پەیوەندیەکی بە فیدراسیۆنی ئەودیوی قەفقازەوە نەبوو، تەنیا قۆناغێك بوو لەرێگای ستراتیژی‌دا واتە فیدراسیۆنی نەتەوە تورك نەژادەکان. ئێستا تێ دەگەین، باکۆ بۆچی فیدرالیست بوو؟

رێبەرانی ئازەر کە واقیع بینو بەرژەوەند پەرست بوون بە برا گەورەکانی عوسمانی خۆیان دەگوت: «وەرن دیپلوماسی بین، لێ‌گەرێن ئێمە یەکەم جار لەگەڵ گورجیو ئەرمەنان یەك بگرینو لەدژی رووسیا راپەرینو دابەش‌بوونی قەفقاز بکەینە عەمەلی، ئەودەم لەگەڵ ئێوە یەك دەگرین). بە تەنیایی‌یان لە گەڵ نەتەوە تورانی‌یەکانی دی؟

پێش بینی ئەمە دژوار بوو، ئازەرەکان دەیانویست سەرەتا ئازەربێجانی ئێران بەخۆیانەوە بلکێننو پاشان قەفقاز بکەنە ئازەربێجانی گەورە، دەیانگوت: گۆرینی قەفقاز کە ئێستا ٣٠% تورکن بۆ تورکستان بەیارمەتی تورکو تورکمانان کارێکی دژوار نی‌یە.

یەك شت بەلگەنەویست بوو، فیدراسیۆنی ئەودیدی قەفقاز هەتا رۆژێك دوای جەنگی رزگاریخوازی قەفقاز نەیدەتوانی بەردەوام بێ، ئازەرەکان دەیانویست نەخشەکەیان بەسوود وەرگرتن لەبیری یەکێتیو هاوکاری نێودەولەتان، جێ‌بەجێ بکەنو بەرووە داغەکان بەدەستی «هاوپەیمان»ە بێ ئاگاکانیان لە ئاگر دەربێننو خودی ئەوان بخەنە نێوکوورەوە.

ئەو مەیلەی تورکو تەتار بۆ ناوچەکانی غەیرە تورکنشین نیشانیان دەدا، بەدلنیاییی

هەر تەنیا مشتومڕێکی سەر کاغەز نەبوو، تورکیای نوێ لە هەوڵی کاردا هەموو هەوڵەکانی خۆی بۆ «جێگیرکردنی ئەو ڕێکخراوانەی لەو ڕێکخراوانە دەچن کە بەهێزیانەوە توانی ئەنادۆل بگرێ» یان بەواتایەکی دیکە پێك هێنانی «شورا میللیەکان»ی لەئەرمەنستانو نارچەکانی دراوسێ، بەکارهێناوە. لێشاوی کاربەدەستانی تورك لە کەمالیەکانی تورکیاو موساواتیەکانی ئازەربێجان بەرەو ئەرمەنستانی سوڤیەتو نارچە خودموختاریە دراوسێکانی (بەتایبەتی نەخچەوان)و لەدوایی‌دا ئازەربێجانی ئێران، دەستی پێکردووە، دەوڵەتی تورکیا لەناوچە سنووریەکانی ئەرمەنستان کۆمەڵێکی زۆری پەناهەندەو هەروەها چەکو چۆڵێکی زۆری داکردووە. کاتێ شەپووری دوا شەڕی پان تورانیزم لێبدرێ، ئەو پەناهەندانە ئەسپی تەروادەی تورکیا پێك دێننو لەمارەیەکی کەمدا ئەرمەنستانی لاوازو داماو لەژێر سمی ئەسپەکانی سەدەکانی ناوەراستی خۆیاندا دەپلیشێننەوە .

تەوریز بنکەیەکی دیکەی پیلانە، یاخی بوونە بەردەوامەکانی هۆزە تورکەکان کە لەم ناوچەیەدا دەبینرێ، بەدەگمەن لەهاندانی خەڵکانی پان تورانیستەوە دوورە، دوورەمین قۆناغ لەبەرنامەی پان تورانیستەکان، دابڕینی ویلایەتەکانی سەرووی ئێران ـ ئازەربێجان، گەیلان، مازندەرانو گورگانو خوراسانە ـ لە ئێران.

لەبەرئەوەی تورکەکان بەشێوەیەکی سرنج ڕاکێش بەرەو رۆژهەڵات ڕادەکێشرێنو هیچ کات مەیدانێکی وا فراوان بو فراوانخوازیەکەیان لەدەست نادەنو گوێ بۆ هەر بانگێکی دۆستایەتیو بەئاشتی پێکەوە ژیان ڕاناگرن، واقیعێکە تەنیا کوێرەکان دەتوانن نەیبینن، هەروەها واقیعێکی بەڵگەنەویستە کە تورکانی رووسیا بەتایبەتی قەفقاز، دوور لەهەر هەڵچوونێك یان بێ لایەنی، لەهەوڵی وریا بوونەوەیان بەرەو رۆژئاواو تورکیا کێش دەکرێن. ئەمرۆ،گورگی تورانی لەبەرزاییەکانی ئالتایی دادو هاوارناکا، بەڵکو لەلوتکەی ئارارات کە بۆتە هی تورکیا، دەلوورێنێو چاوەروانی هەلێکە کە بێچووە گورگەکانی خۆی بۆ هێرش کردنەسەر دەورووبەر، بەتایبەتی ئەرمەنستانو ئازەربایجانی ئێران، هان بدا.

لەوانەیە هەندێ کەس لەخۆیان بپرسن کە گەرانەوە بۆ پرانسیپو بنەمای پان تورانیزم چ پێویستیەکی هەبوو، ئەوەندە بەس نەبوو کە لەئارەزووو هەوڵەکانی دەدوێین؟ بەبڕوای ئێمە نا، چونکە لە نێو سیاسەتمەدارو هەتا پسپۆرانی کاروباری تورکیادا کەسانێکی وا هەن دەڵێن بەرنامەی لەم جۆرە نیەو هەندێکی دیکە باوەڕیان وایە، ئەگەر نەخشەی واش هەبێ، جگە لە فەنتازیار خەیالپەروەریو ئاژاوەگێری، شتێکی دیکە نیە. ئەوان لەراستی‌دا، لەجیددی بوونی بزافی پان تورانیزم دوودڵن.

لەدوایی‌دا کەسانێك هەن لەگەڵ ناسینی پان تورانیزمو قبوولکردنی نەخشە ترسناکەکانی‌دا، بەکردەوە وا رەفتار دەکەن، دەڵێی هیچ لەگۆڕێ دانیە. نازانین، گومان لە بێئاگاییان بکەین، یان لە دڵسۆزیان؟

ئامانجمان لەنووسینی ئەم کتێبە رۆشن کردنەوەی مێشکی خوێنەرانە بە پێی بەڵگەنامەی راستو دروست لەسەر دیاردەیەك کە بەهێزەوە دەرکەوتووەو ناتوانرێ بەچاو لێپۆشینو خۆلێدزینەوەو بەبێ هەبوونی زانیاری، خەباتی لەدژدا بکرێ. سروشتیە،

ئەگەر بیروباوەڕو مەیلەکانی پان تورانیزم، بەڕوونی باس نەکەین، نەخشەو کارەکانیان بەریکەوتەو پەرش و بلاوو بەپێچەوانەی ئەقڵ و سەیروسەمەرە دێتە بەرچاو.

خەڵکی ئاسایی هیچ زانیاری‌یەکیان دەربارەی مەیل و مەبەستی پان تورانیستەکان، واقیعی دەروونناسی، ڕێرەوە فیکری و بنچینەی ئامانجەکانیان لەرووی نەژاد، ژیۆپۆلیتیکی و ئابووری‌یەوە، نی‌یە. زانیاری‌یەکانیان دەربارەی تیزی سیاسی کە ئیلهامبەخشی تورکیای هاوچەرخیشە، زۆر لاوازە، لەم بارەدا نەناسینی پان تورانیزم و سیاسەتیی میللی تورکیا کە لەسەر ئەو بنچینەیە دارێژراوە، بەدابڕینێکی گەورە دەژمێردرێ، هەروەها سروشتی‌یە کە یەکێکی بەریژدان بەگوتەو ڕاگەیەنراوەکان رازی نەبێ، لەباسی ئامانج و ئەیدیۆلۆژی تورکاندا دەبێ ڕاپگەیەنین کە بۆچی ئێمە پێشبینی و هەڵهێنجراوەکانیان دورپات دەکەینەوە، دەبێ بڵێین، لەکوێوە دەزانین ئەوان مەیل و بیروباوەری لەو جۆرەیان هەیە، بۆ سەلماندنی قسەکانمان، پێویستمان بە بەڵگەی جێگیرو ڕۆشن و رەوار سەلمێنراو هەیە.

ئێمە هەوڵمان نەداوە تێروانینەکانمان بەپێی هەڵێنجراو یان بەڵگەنامەکان بگونجێنین کە لەبەڵگەنامە مێژوویی‌یەکان یان گوتەی کەسایەتی‌یەکانی تورک و بێگانەوە کۆمان کردوونەتەوە. بە پێویستمان زانی سەرهەڵدانو وەرگۆڕانەکانی پان تورانیزم تاوتوێ بکەین، چونکە هەروەك سان فرانسوا ئەسیزی گوتوویەتی: «کاتێ لەرەگی بابەتێك دەکۆڵینەوە تێروانینێکی تەواوتری دەربارەی وەدەست دەخەین، چونکە رەگو پرانسیپ بەشتێکی گرنگی هەر بابەتێك و هەتا سەرەکی‌ترین بەشی دادەنرێن».

مەبەستمان لەنووسینی مێژووی پان تورانیزم ئەوەبوو، نەتەنیا وەك ئایدیۆلۆژیایەکی سادە، بەڵکو وەك هێزێکی زیندوو بیناسێنین کە خۆی لە هەموو لایەنەکانی ژیانی گەلانی تورانی نیشان داوە: ژیانی رۆشنبیری ئایینی، کۆمەلایەتی، ئابووری و هەڵبەتە سیاسی کە بەتەواوی گۆڕیویەتی، و بزانین ئەم «فانتازی‌یە بێ بنچینە»و «ئاژاوەی بێ ئاییندە»یە لە چ جێگایەکەوە سەرچاوەی گرتووەو چۆن هەنگاو بە هەنگاو ئامانجی پان تورانیستەکانی کردۆتە واقیعیەتی سیاسی کە پێشتر تەنیا تیز بوو.

لەدوا بەشی ئەم کتێبەدا کە تایبەتی «پان تورانیزمی ئەمڕۆ»ی هەیە، دەبێ ئەم ڕاستی‌یە تاڵو ترسناکە دووپات بکەینەوە کە ئەوان هەرگیز ئامانجی «تورانی یەکگرتوو و سەربەخۆ»یان تورور نەداوەو هێشتاش بە «نهێنی‌ترین و هێژاترین ئامانجی خۆی»ی دادەنێن.

ئامانج زۆر هێژایە نەك نهێنی، چونکە لەرۆژنامەکانی تورکیادا مشتومڕو گفتوگۆی دەربارەی دەکەن. لەبەر هەندێ، ئەو نەخشەیەی ئەوان لەبەردەمیانە شتێکی نوێ نی‌یە، بەڵکوو دەست پێ‌کردنەوەی ئامانجە کۆنەکانیانە کە وەدی نەهاتوون و ڕاگیراون تا لەیەکەمین هەلدا وەری بکەوێتەوە.

ڕەشەکوژی ئەرمەنەکانی ڕۆژئاوا لەنیسانی ۱۹۱۵دا بەهیچ شێوەیەك مەترسی مەرگی لێ دوورنەخستوونەتەوو هەردەم بوار هەڵکەوێ، دووپات دەبێتەوەو بوونی ئەرمەنەکان کە لەوڵاتێکی زۆر گچکەی دەورووبەری ئارگاتس و کۆماری سیونیك دوا پێگەو پەناگاو سەنگەریان کۆکردۆتەوە، دەخاتە بەر هەڕەشە. لەبەردەم ئەو پێشگوتنە بەناوبانگەی کە

پێش چەند سەدە تورکیای بە «پیاوە نەخۆشەکەی ئەورووپا» ناودەبردو پارچە پارچە بوونی لە ئایندەدا پێشبینی دەکرد، تورکەکان رێك بەمەبەستی رێگاگرتن لەدابەشبوونێکی وا روویان کردە رۆژهەلاتو بەهەنگاوی مکووم بەرەو برا هاوخوێنەکانیان لەئاسیای ناوەراست بەهەشتاو دەرۆن. ئەرمەنەکان کە بەتەگەرەیەك لەسەر ئەم رێگایە دادەنرێن یان دەبێ خاکی خۆیان بەجێ بهێڵن یان لەنێو بچن. لەروانگەی تورکاندا، رێگا چارەیەکی دیکە نی‌یە، ئەم بریارە پەشیمانی لەدواوە نی‌یەو بێ بەزەیی‌یانەیە.

ئێستا دەبێ بزانین وەدی هاتنی ئەم ئارەزووانە تا چ رادەیەك لەتوانادایە، ئایا ئەوان توانای رۆشنبیری، مەعنەوی، رێکخراوەیی‌و ماددی پێویستیان بۆ ئەم کارە هەیە؟ ئایا ولاتانی ئەورووپایی مۆلەت دەدەن ئەوان رەفتاری درندانەی جەنگیزو تەیمووری لەنگ بکەنەوە؟ بەتایبەتی رووسیا کە چەکەکانی پان تورانیزم بەرووی ئەودا ئاماژەکراوە؟

ئەم کتێبە، لەوانەیە ئەم پرسیارانە لەمێشکی خوێنەراندا بوروروژێنێ،و هەروەها پرسیاری دیکەش، ئەم پرسیارە تووندانە کە فیکری هەر نیشتمانپەروەرێك تا رادەی دلەراوکێ خەریك دەکەن، پێویستی‌یان بەرۆشن کردنو وەلام هەیە. ئێمە وامان پێ باش بوو، باسێکی بێ لایەنانە لەواقیع بخەینە بەردەستی خوێنەران تا خۆیان ئەنجامێك هەلێنجن.

---

* . واتە ئەم کتێبە لەسالی ١٩٢٦دا نووسراوە.

** . نووسەر لێرەدا کەوتۆتە دوو هەلەی زەقەوە، یەکەم: ئێزیدی‌یەکانی لەگەل موسلمانان داناوەو دووەم: شەیتانی بە (ئیمام)و گەورەی ئەوان لەقەلەم داوە.

*** . ئەم «مانگی هەنگوینە» لەسالی ١٩٢٨ تەواوبوو، دەولەتی سۆڤیەتی کەلەسەرەتای هەولەکانی‌دا بۆ گێرانەوەی دەستەلاتی رووسیا، بو قەفقاز لەسالانی ١٩١٩-١٩٢١، چ لەلایەنی سیاسەتی دەرەوە بۆ وەدەست خستنی هاوکاری کەمالیستەکانی تورکیاو چ بۆ کۆنترۆلکردنی نەتەوەکانی قەفقاز، مەیدانی کاری بۆ هەندێ لایەنی موساواتی‌یەکانی ئازەربێجان (لەوانە بزافی پان تورکی‌یەکەیان) ئاوەلاکرد. لەسالانی دوای گێرانەوەی دەستەلاتی بەسەر هەموو قەفقازیشدا تورکی لەنێو هەندێ نەتەوەو هۆزی قەفقازدا (بەتایبەتی داغستانی‌یەکان) برەو پێ دەدا، بەلام لەسالی ١٩٢٨ لەگەل سیاسەتی تازەی سۆڤیەت لەبەگژداچوونەوەی پان تورکیزم، هاوکات زمانی تورکی رەسمی بوونی خۆی لەدەست داو زمانە نارچەیی‌یەکان متمانەی خۆیان وەدەست کەوتەوە.

١ _CF. Gaorges_ Geulis Berthes, "Angora, Constantiresple, London 1922.

٢ _ CF Owaket. 24 janvier 1926_ page 3.

٣ _ CF. "Hakimiyti Milliye" 24 avril 1926, Aloccasion du kouroultai"

٤ _ CF Ceorges_ Gaulis Berthes , la Nouvelle Turquie" 1924

٥ _ CF. labonne Roger, "LaTurquie Laique"
"Le Correspondant," septembre 1924

٦_ CF. Georjes_ Gaulis Berthes, op. cit.

٧_ CF.Waket, 23 janvier 1926, "pour l union turque".
"Les Turcs du nord parlent de lunion turqe."

٨ _ CF. Yeni kapkassia premiernumero, 26 septembre 1923.

٩ _ CF. Waket 31 decembre 1925:23,2631,26,31,janvier
17,feviere et 3 mars 1926

١٠_ CF. "Encyclopedia Britannica," 12e edition,
artecle "Azerbaidjan".

# ناوەرۆك

## لەچاپکراوەکانی وەرگێڕ

| | | |
|---|---|---|
| ١ـ کۆلۆمبس کیشوەرێکی تر دەدۆزێتەوە | شیعر | ١٩٧٦ |
| ٢ـ گیڤارای شۆڕشگێر | وەرگێڕان | ١٩٧٨ |
| ٣ـ تووڕەیی شاخەکان | شیعر | ١٩٨٦ |
| ٤ـ سروودی بەرەنگاری | شیعر | ١٩٨٧ |
| ٥ـ کۆمۆنی پاریس | نووسین | ١٩٨٩ |

وەرگێڕ، ئەم بەرهەمانەی خوارەوەشی وەرگێڕاوەو ئامادەی چاپن:

١ـ هەموو شتێك لەبەرەی رۆژئاوادا هێمنە (رۆمان) ئریش ماریا ریمارك
٢ـ دوا وێستگە (رۆمان) ئریش ماریا ریمارك
٣ـ لەئاستانەی سەرکەوتن دا (رۆمان) ئاڤریل میخائیل
٤ـ خەناوکەیەك بۆ سەرمینازەکەم (رۆمان) ئەحمەد خان ئەبوبەکر
٥ـ ئائورا (رۆمان) کارلۆس فۆینتس
٦ـ قوربانی (رۆمان) کورتزیۆ مالاپارتێ
٧ـ پارتیزانەکانی لیڤانت خیسوس ئیسکارای
٨ـ سەفەرنامەی هێزی بایندەر
٩ـ شەڕی پارتیزانی ناوشار
وهی تر...

# الطورانية

## ظهورها ، ايديولوجيتها وبرنامجها

تأليف : زاره واند

ترجمه عن الفارسية : ابوبكر خوشناو

هه ولير 1996

نرخى (٢٠) دينار